# LaSemantique

# واتـــــا ســــازی

# Semantic

**کلۆدجیێرمان**      **ریمون لۆبلان**

**زانکۆی مونتریال**      **زانکۆی ئۆتاوە**

**وەرگێر**

**د. یوسف شەریف سعید**

**زانکۆی سەلاحەدین-هەولێر**








**ناوی کتێب: واتاسازی**

- کلۆدجیێرمان – ریمو لۆبلان
- وەرگێڕانی: د. یوسف شەریف سعید
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- ژمارەی سپاردن: ٨٨١
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپی یەکەم ٢٠٠٦
- نرخ: ١٥٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب (٢٠٠)





**دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی**

**www.mukiryani.com**

**asokareem@ maktoob.com**

**Tel: 2260311**

# پێرست


پێشەکی وەرگێری عەرەبی ........ ت

پێشەکی دانەران ........ خ

**بەشی یەکەم: کێشەکانی واتا** ........ ١

أ- واتای ووشەیی چی یە ........ ١

ب- بابەتی واتاسازی ........ ٩

**بەشی دووەم: لێڵی فەرهەنگی** ........ ٢٦

أ- فرە واتاییو رەگەزدۆزی ........ ٢٦

ب- واتاو بەکارهێنان ........ ٢٩

ج- شێوەکانی لێڵی ........ ٣٢

د- شوێنو لێڵی ........

٣٣

**بەشی سێیەم: واتای ووشە** ........ ٣٧

أ- کیلگەی واتایی ........ ٣٨

ب- پەیوەندییە واتاییەکان ........ ٤٥

ج- شیکردنەوەی پێکهاتە ........ ٥٢





**بەشی چوارەم: واتای رستە** ........ ٧٣

أ- یاساکانی کەواندن ........ ٧٣

ب- ژمێریاری رێژەی پشتەکان ........ ٨٤

ج- گریمانەیی ........ ٨٦

**بەشی پێنجەم: پەیوەندی نێوان رێزمانو واتاسازی** ........ ٩٠

١- پێکهێنی رۆنانی ........ ٩١

٢- پێکهێنی واتایی ........ ٩١

٣- پێکهێنی دەنگسازی ........ ٩١

تیۆری نموونەیی ........ ٩٢

لیستی سەرچاوەکان ........ ٩٩

## پێشەکی

نزیکەی پازدە ساڵێك دەبێت کە خوێندنی باڵا لەبەشی کوردی کۆلێجی ئاداب لەزانکۆی سەلاحەدین کراوەتەوە، بەدرێژایی ئەو ماوەیە بۆ بابەتی واتا سازیsymantic سوود لە چەندین سەرچاوە بەزمانی ئینگلیزیو عەرەبی وەرگیراوە بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو قوتابیانەی کە لەخوێندنی باڵا وەردەگرین تارادەیەك شارەزاییان لەودوو زمانەدا کەمەو ناتوانن بەپێی پێویست سوودی لێ وەربگرن، هەروەها لەبەر نەبوونی هیچ سەرچاوەیەك بۆ واتاسازی لە زمانی کوردی دا، بەپێویستم زانی ئەم کتێبە"Lesemantique"ی "کلود جیرمان" مامۆستا لە زانکۆی مۆنتریالو " ریمون لوبلان" مامۆستا لەزانکۆی ئۆتاوە کە لەلایەن" د. نور الهدی لۆشن" کراوە بە عەرەبی لەزانکۆی قاریۆنس لە بەنیغازی ی لیبیا وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی چونکە وای بۆ دەچم کە سوودێکی باش بە قوتابیانی خوێندنی باڵا بەزمانی کوردی بگەیەنی و هەورەها ئارەزوومەندانی بابەتی واتا سازیش سوودی لێ وەردەگرن.

لەکاتی وەرگێڕانەکە دا هەوڵم داوە ئەو زاراوانەی کەباونو بەکاردەهێنرێنو لەگەڵ سەلیقەی زمانەکەدا دەگونجێن بەکاربێنم، گرنگی کتێبەکش لەوەدایە کە رووبەری واتاسازی تارادەیەکی باش داپۆشیوەو لە پێنج بەشدا پوختەی بابەتەکانی واتاسازی بەم شێوەیەی خوارەوە خستۆتە روو.

بەشی یەکەم لەدوو پار پێك هاتووە، پاری یەکەم بۆشێوەکانی واتا, واتای وشەیی, وشەوشت, ناولێنراووچەمكو چەمكو سەرچاوەو چەمك, نرخ دانراوە.



پاری دووەم لەبابەتی واتاسازی وشە، وشە وەك بابەتێکی بەرایی واتا سازی، وشە وەك دانەیەکی شیکردنەوە، رستە، رستە وەك بابەتی یەکەمی واتا، رۆڵی واتای رستە. سەختی رۆلیَ شیکردنەوەی واتایی، زمانو تێروانینی جیهانی دەدوێت.

بەشی دووەم تایبەتە بە لێڵی فەرهەنگی، لەم بەشەدا باس لە فرەواتاییو رەگەز دۆزیو واتاو بەکارهێنانو شێوەکانی لێڵی، شوێن و لێڵی کراوە.

بەشی سێیەم تەرخان کراوە بۆ واتای وشە، لەم بەشەدا تیشك خراوەتە سەر کێلگەی واتاییو گریمانەی تریروکێشەی دەستنیشانکردن. لێرەدا دوو جۆرە دەستینشانکردن باسیان لێوەکراوە یەکەم دەستنیشانکردنی کێلگەی واتایی دووەم دەستنیشانکردنی یەکەکان. هەروەها باس لە بۆچوون لەپەیوەندیەکانی واتا، هاوواتا، گرتنەوەو پەیوەندییەکانی تری واتا کراوە . لە شیکردنەوی پێکهاتەکاندا باس لە سەرچاوە, پێناسەکان, دارشتن, شیکردنەوەی پێکهاتەیی, کێڵگەی واتاییو هزرەکانی واتا کراوە.

بەشی چوارەم تایبەتە بە واتای رستە، لەم بەشەدا باس لەیاساکانی کەواندن, ژمێریاری رێژەیی پاڵپشتەکانو گریمانەیی کراوە.

بەشی پێنجەم کە دوا بەشی کتێبەکەیە بۆ ئەنجامو پەیوەندی نێوان رێزمانو واتا سازی تەرخان کراوە، لەم بەشەدا باس لەپێکهێنی رۆنانیو واتاییو دەنگسازی کراوە، ئینجا بە وردی باسی تیۆری نموونەیی کراوە.

هیوادارم سوودێکم بەقوتابیانی خوێندنی باڵا گەیاندبیَو بەم کارە کەلێنێکم لە کتێبخانەی کوردی پڕ کردبێتەوە.

**یوسف شەریف سەعید**

**٢٠٠٦/٥/١٦**

## پێشەکی وەرگێڕی (عەرەبی)

واتاسازی Semantic بەوە ناسراوە کە لێکۆڵینەوەیە لە واتا، ئەم زاراوەیەش لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم لەسەر دەستی زانای فەرەنسی میشاڵ بریل Michel Breal لە ساڵی ١٨٨٣ سەری هەڵدا، کە مەبەستەکەی واتاسازی بوو.

زمانەوانە فەرەنسییەکان بۆ ماوەیەك کێشەی واتاسازی یان واتایان, بەبابەتەکانی شێواز ناسیو لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکان دادەنا، دواتر دووبارە ئەم زانستەیان خستە ناو لێکۆڵینەوە زمانیەکانەوە.

لەسەدەی بیستەم دا لێکۆڵینەوە لە واتاو واتاسازیدا گەشەی کردو بوارێکی فراوانی گرت, رێبازی بەدیارکەوتو لێکۆڵینەوەکان گەشەیان بەخۆوە بینی، تەنانەت لێکۆڵینەوەکان تەنیا پەیوەست نەبوون بەلایەنی مێژوییەوە، بەڵکو لایەنی کۆمەڵایەتیو دەروونیو مرۆڤایەتیو گشت ئەو بابەتانەش کەسەر بە واتا، یان پەیوەنداربوون بە واتا لەخۆ دەگرت.

واتا سازیش لەواتاکانی زمان دەکۆڵێتەوە، واتە تەنیا لەگەڵ هێما زمانیەکاندا کار دەکات، هەرچەندە بابەتی هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە رۆڵی نیشانە یان هێماییان هەیە، ئەویش چ زمانی بن، چ نازمانی، بەڵام بایەخ دانو داکۆکی کردن تەنیا لە واتای زمانی دا دەبێت لە بوارەکانی لێکۆڵینەوە زمانیەکاندا.

کەواتە بابەتی  واتاسازی بریتییە لە واتای زمانی، واتای زمانیش، لەواتای تاکی وشەوە کە لە رووی دۆخی فەرهەنگیو بەدواداچوونی گەشەی واتاییو ئەو گۆڕانکاریانەی کەبەسەر وشەدا دێت، لە بەکارهێنانی جیاوازدا کە زەحمەتە دەست نیشانی واتای وشەبکرێت، سەرهەڵدەدات، چونکە وشە خۆی لەخۆیدا



هەڵگری واتایەکی رەها نییە، بەڵکو بەکارهێنانو دەوروبەر (سیاق) دەستنیشانی واتای راستەقینەی وشەکە دەکەن.

ئەمەو سەرەرای لێکۆڵینەوەی دەنگەکانو پەیوەندی رۆنانە کاریگەرەکە کەبەرەو لێکۆڵینەوەیەکی تەواو دەڕوات. ئەم توخمانە یان ئەو بنەمایەش لەچوارچێوەی جۆرەکانی واتادان کەبریتین لە:

١- واتای بنجی فەرهەنگی

٢- واتای وشەسازی

٣- واتای رستەسازی

٤- واتای دەوروبەرو شوێن(سیاق)

کە ئەم جۆرانەش بەپێ ی لێکۆڵەر یان ئەو قوتابخانەو رێبازە دەگۆڕێن کە پشتی  پێ دەبەسترێ.

یەکێ لە گرنگترین بنەماکانی واتا هێمایە، واتە بیرو ئەو شتەی کە ئاماژەی بۆ دەکرێ، بە پشت بەستن بە جووتەکانی زمان/ گوتن.[1] نیشانە زمانیەکان لەسەر جووتەی ناوو ناولێنراوبونیاد دەنرێن، لەم رووە واتا سازی رووبەرووی کۆمەڵێك کێشە بۆتەوە لە وانە:

- نەبوونی زاراوەی سنوردار.
- بەکارهێنانی زاراوەکەلە چوار چێوەی پسپۆری جیاوازدا.

لەم کتێبەدا کە لەبەر دەستمان دایە دانەرەکان جۆرەکانی واتاو ئەو کێشانەی کە رووبەڕووی واتا دەبنەوە باس دەکەن.

ئەم دوو دانەرە پرسیان لە چۆنیەتی واتای وشەو چەمكو سەرچاوەکردوەو هەروەها باسی رستەیان وەکو بابەتی یەکەمی واتا کردووەو دەستنیشانی ئەو

(1) جووتەکانی فردیناند دی سۆسێر

تەگەرانەیان کردووە کە رووبە رووی گەڕان بەدوای واتای وشە دەبێتەوە وەکو یەکەیەکی شیکردنەوەی واتایی، ئەمەش لە بەشی یەکەم دا باس کراوە.

لە بەشی دووەم دا کێشەی لێڵی فەرهەنگییان باسکردووە لەروانگەی هاوبێژ و رۆلی دەوربەرو (سیاق) یان لە بەکارهێنانی زمانیدا.

لە بەشی سێیەمو چوارەم دا لەواتای وشەو کێلگەی واتاییو شیکردنەوەی پێکهێنەرەکانیان دواون، ئەمەش لە ڕێگای پەیوەندییە واتاییەکانیو دوواتر واتای رستەو هەندێ یاسای پۆلێنکردنیان لە بەرچاو گرتووە، لەم دوو بەشەدا ئەو کێشانەیان ورژاندووە کەهەندێ کەس وشە بە بابەتی یەکەمی واتا دادەنێو هەندێکی تر کە رستە بە باش دەزانن ببێتە بابەتی یەکەمی واتا.

بەشی پێنجەمیش کە کۆتایی کتێبەکەیە، ئەم بەشە تەرخان کراوە بۆ پەیوەندی ئالۆزی نێوان رستەسازیو واتاسازی لە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوەکانی سەر بەرێبازی چۆمسکی.

منیش لەم وەرگێڕانەدا هەوڵم داوە کرۆکی بابەتەکان وەکو خۆیان بەجێ بهێڵم هەروەك چۆن دانەران دایان ناوە ئەمەش وای لێکردم هەندێ جار بیرەکان وەکو خۆی چۆن لەفەرەنسی یەوە هاتووە دایان بنێم، بەتایبەتی لە خشتەی ناوی ئاژەڵەکاندا، چونکە وەرگێڕانیان بۆ سەر زمانی عەرەبی ئەم ئامانجەی کە بۆی دانراوە لە دەست دەدات لەکاتێکدا هەوڵم داوە هەندێ ناو بگۆڕم وەکو ناوی"Pierre" و"Marie "کە لەجیاتیان ئەحمەدو فاتیمەم داناوە.

هەرچی پێناسەی زارەوە زمانیەکانە ئەمانەش لەژێر رۆشنایی فەرهەنگە زمانیەکان دانراون، ئەوەی زیادبوو بێ و هیچ کاریگەریەکی بەسەر بابەتەکان نەبووبێ لام داوە.

هیوادارم توانیبم لێکۆڵینەوەی واتایی بخەمە بەردەست خوێنەری عەرەب, سەرکەوتن لەلایەن خوداوەیە.



## پێشەکی دانەران

## دەرخستن و بابەتی واتاسازی

زۆر زەحمەتە وا بیر بکەینەوە کە وانەیەکی, دەروازەیەك بۆ زمانەوانی گشتی, بەشێکی تایبەتی بە لێکۆڵینەوەی واتا تێدا نەبێت، واتە واتاسازی.

لەگەڵ ئەوەشا هەندێ جار، وا ڕێك دەکەوێت کە ئەم بوارە گرنگەی زمانەوانی هەر بەتەواوی باسی لێوە نەکرابێت، یان لێکۆڵینەوەیەکی کەمی لەسەر کرابێت، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ کورتی ماوە( چونکە لێکۆڵینەوە لە واتا دووادەخرێت بۆ کۆتایی لێکۆڵینەوە)یان قورسی بابەتەکە.

بەڵام ئەگەر ئێمە دان بەوە بنێین کە زمان یەکەم جار بەوە پێناسە دەکرێت کە ئامێرێکە بۆ پەیوەندیکردن، ئەوسا زۆر مایەی داخە کە لێکۆڵینەوەی ناوەڕۆك یان واتاسازی پشت گوێ بخرێت.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەو کێشانەی کە رووبەرووی واتاناسان دەبێتەوە باس دەکەین. بەم هۆیەوە لەبەشی یەکەم دا پرسیار لە واتای وشە دەکەینو دواتر پێداچوونەوە لەسەر ئەو تەگەرانە دەکەین کە بەوەرگرتنی واتایی وشە وەکو یەکەیەکی لێکۆڵینەوە لە واتا رووبەروو دەبینەوە.

پشت بەو کارانە دەبەستین کە رستە دەکەنە بابەتی یەکەمی واتا.

سەرەرای ئەمەش هەندێ بایەخ بە تەنگو چەڵەمەکانی کاری واتاناسەکان دەدەین.

لە بەشی دووەمدا، لە روانگەی وەك یەكو هاوبێژدا باس لە كێشەی لێڵی فەرهەنگی دەكەین، كە لە واتادا رۆڵی دەوروبەری زمانیو دۆخی دەوروبەری زمانەوانی دەوروژێنێ.

بەشی سێیەمو چوارەمیش تەرخان كراوە بەو كێشانەی كە بابەتی وشە دەكەنە كرۆكی واتاسازیو ئەوانەی كە رستە بە باشتر دەزانین بۆ لێكۆڵینەوە لە واتاسازی.

لە بەشی كورتەو دەرئەنجامدا هەوڵ دەدات دەست نیشانی كورتەیەك لەو پەیوەندیە ئاڵۆزەبكات كە لەنێوان رێزمانو واتا دا هەیە بەتایبەتی لەژێر رۆشنایی ئەو كارانەی كەلەسەر بنەمای زمانەوانی چۆمسكییەوە بنیات نراوە.



**بابەتی لێكۆڵینەوەكە:**

لەكۆتایی لێكۆڵینەوەكە دەتوانین لە:

١- جیاكردنەوەی ژمارەیەك لەو زاراوانەی كە بەوردی بە واتای زمانیەوە گرێ دەراوە، بەتایبەتی: چەمك، سەرچاوە، بەها.

٢- تاووتۆی كردنی نموونە جیا جیاكانی ئەو كێشانەی كە وشە، یان رستە دەكەنە بابەتی یەكەمی واتاسازی.

٣- هەست كردنی رووداوی كە زمان دابەشكردنی تایبەتی راستیەكانی تێدایە.

٤- بەیەكەوە گرتنو هاوسەنگی, كردە ناوەندیەكان, پێوەرە لەبارەكانی نێوان وەك یەكو هاوبێژ.

٥- دوای بەكارهێنانەكانی كارەكی، جیاكردنەوەی توانا و سنوری تیۆری بەكار هێنان(عادەت)، بە تایبەتی ئەوانەی لەلایەن فەرهەنگ سازەكانەوە بەكار دەهێنرێت.

٦- باس لە رۆڵی چوارچێوەی زمانیو دۆخ لە دەرەوەی زمانەوانی سەبارەت بە لێڵی فەرهەنگی دەكات.

٧- پێداچوونەوەی هەندێ گریمانە لەپاڵ كۆمەڵێك لە یاساكان(نوسراوەكان)ی دەرچوو تا ئێستا لەچوارچێوەی واتای وشە, كێڵگەی واتایی, پەیوەندی نێوان واتاو شیكردنەوەی واتایی.

٨- پیادەكردنی هەندێ كردەی شیكردن پێشنیازكراوەكانی لەبواری واتای رستە, یاساكانی كەوتن, ژمێریاری پاڵپشتو گریمانەكان.

٩- شارەزابوونی دوو رێگای جیاواز بۆ تێروانینی ئەو پەیوەندیەی لە نێوان رێزمانو واتاسازیدا هەیە لەچوارچێوەی رێزمانی بەرهەم هێنانو گوێزانەوە.

# بەشی یەکەم

## کێشەکانی واتا

کێشەکانی واتا کۆمەڵێك لەو پرسیارانە دەگرێتەوە خۆ کە لەبواری لێکۆڵینەوە دێنە ئاراوە. کێشەکانی واتا، کۆمەڵە کێشەیەکە کە لە واتاسازی، لەم بەشەدا دەکرێت، لەپاڵ ئەو پرسیارە سەرەکیانەی کە رووبەرووی واتاناس دەبێتەوە هەندێ راستی بەدیار دەکەوێت.

بێ گومان دەبێ دەستنیشانی باری یەکەمی واتا بکەین، بەداخەوە هیچ وەلاّمێك بۆ کێشە چارەسەرنە کراوەکان نادۆزینەوە، ئەمەش ئەو بەردەوامییە کە دەبێ لەم بەشەدا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت.

**ئەلف: واتای وشە چی یە؟**

پێناسەی واتاسازی وەك لێکۆڵینەوە یان زانستی واتا" بۆتە کارێکی سروشتی لێراهاتوو لە زمانەوانیدا، بەلاّم هیچ سودێك لەم پێناسە گشتییە وەرناگیرێت تا مەبەست لە واتا دیاری نەکەین(Signification). بەم شێوەیە لەم ساتەوە کە هەوڵ دەدەین بۆ دیاری کردنی واتا کێشەی زۆر سەر هەڵدەدات، لەوانە:



- ئایا دەتوانین بگەینە پێناسەی واتای وشە؟

**١- وشەو شت:**

لای ئەفلاتوون بۆ نموونە واتای وشە ئەو شتە ناولێنراوەیە بە وشە. واتای مێز(table) ئەو بابەتە بەرجەستەیەی مێزە" بەلاّم ئەو گەشەیەی نیشانەی زمانی کارێکی ئاسان نیە.

لە راستیدا ئێمە وا بەروونی بیر لە ناولێنراوەکانی زۆربەی ئاوەڵناوەکان ناکەینەوە وەك( باش، جوان...هتد) هەروەها کارەکان وەك کاری (رۆیشتن) یان هەندێ جۆری گوتن وەك(ئامرازی پەیوەندیو ئامرازی بەستن..هتد)

سەرەڕای ئەمەش هەڵوێستمان چییە دەربارەی وشە نا بەرجەستەکانی وەك(ئازادی) یان ئەو وشانەی کە لەگەڵ کرۆکی راستەقینەیان ناگونجێن وەك(جنۆکە، ساحیر.....هتد) هەروەك " فریج Frege " ی لۆجێك ناس روونی کردۆتەوە، ئەگەر وشەیەك یان دەستەواژەیەك لەگەڵ بابەتە بەرجەستەکەی یەکتریان گرتەوە هیچ پێویست ناکات ناوو ناولێنراویەکتر بگرنەوە: ئەستێرەی ئێوارانو ئەستێرە بەیانیان دوو دەستەواژەنو یەك واتا ناگەیەنن، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەردووکیان یەك ناولێنراون بۆ ( هەسارەی ڤینۆس). ناچارین لێرەدا شتێکی بخەینە سەر ئەویش ئەوەیە کە سنوری راستیەکان هەندێ جار لێڵن: پیری لەکوێ دەست پێدەکات، لاوی لەکوێ کۆتایی پێدێت؟ شەو رۆژ، فێنکیو گەرمی، ..هتد.

**٢- ناولێنراو وچەمك(مەزندەكردن - تصور):**

ڕێگایەكی تر هەیە بۆ مەزندەكردنی واتا( الدلالە)[١] (signification) ئەویش بە دامەزراندنی پەیوەندی نێوان وشەیەكو ڕاستیەكان بەهۆی مەزەندە كردنەوە، لێرەدا واتای وشەی( مێز) تەنیا بابەتە بەرجەستەكە نیە بەڵكو مەزندەو بیركرنەوەیە لە(مێز) ئەو مەزندەیەی كە بەستراوە بەراستیەكانی (مێز) بۆ ئەوەی باش هەست پێ بكەین كە بە چی یەوە بەندە، دەگەڕێینەوە سەر مەزندەی" دی سۆسێر "f. de saussure".

بەنیسبەت سۆسێر" پەیوەندی زمانی، خاوەن سروشتێكی دەروونی بنەمایەكە بۆ دروست كردنی كرۆكی دوو ڕووە، ئامادەكراوە بۆدەرخستنی چەمكو ناولێنراو،و وێنەی دەنگی یان ناو، ئەم مەزندەیەش لە هێلكارییەكی وەك ئەمەی خوارەوە بەرجەستە دەكات.




واتاسازیش ئەو زانستەیە كە بەوردی بایەخ بە ناولێنراوی نیشانەی زمانی دەدات (ناو و ناولێنراو) وەكو دوو زاراوەی هاوواتا بەكارهێنراون).

(١) signification هەندێ جار بە واتا هەندێ جار بەواتاسازی لێك دەدەینەوە بەپێی ئەو چوار چێوەی كەتیایدا بەكارهاتووە.



سەرەڕای ئەمەش " دی سۆسێر" بە تیۆرییەكەی خۆی دەربارەی نیشانەكانی زمانی بە بۆچوونی زۆربەی زمانەوانان بەداهێنەری ڕاستەقینەی واتاسازی هاوچەرخ دەژمێردرێت.

بەڵام ئەوەی كەدەبێ لە ناولێنراو بگەین"Signifie" زۆر ڕوونو ئاشكرا نیە، چونكە لەهەندێ نێوەندا بە هاوواتای" شت" "Chose" دادەنرێت، لەهەندێ شوێنی تر بەواتای مەزندەو بیر، واتە بە كرۆكی زانستی دەروونناسی یا لۆجێك دادەنرێت، لەدوای" دی سۆسێر" هەوڵێكی زۆرو كۆششێكی زیاد كراوە بۆ دانانی چەمكێكی ورد بۆ مەزندەی نیشانەی زمانی.

**٣- چەمكو سەرچاوە:**

لەو هەوڵانەی كە لەم بوارەدا دراوە، ئاماژە بە هەوڵی دوو زمانەوانی ئینگلیزی دەكەین " ریچاردزو ئۆگدینە"Richards & Ogden" ئەم دوو زانایە لە ساڵی ١٩٢٣ كتێبێكیان بڵاو كردەوە بەناونیشانی (واتای واتا). لەم كتێبەدا سێگۆشەیەكی واتاییان لەژێر ناوی سێ گۆشەی بنچی خستە ڕوو.



بۆنموونه ئەگەر وشەی(مێز) وەربگرین، ناوەکە وێنەیەکی بیستراوە کەلەگەڵ زەنگی دەنگەکانی (م، ێ ، ز) رێك دەکەوێت.

ناولێنراوەکەش ئەو بیرەیە، یان مەزندەیە بۆ (مێز). سەرچاوەکەش ئەو بابەتە بەرجەستەیان بابەتی هەست پێکراوەیە کە (مێزە)ە.

نیشانەی زمانی لەسێ گۆشەکەدا باڵی چەپ دەینوێنێ کە بریتی یە لە پەیوەندی نێوان ناو و ناولێنراو.

سەرچاوەش ئەو پەیوەندییەیە لەنێوان نیشانەی زمانیو سەرچاوەو ئەو شتەی دەرەوە(واتە دەرەوەی زمانەوانی).

پەیوەندی نێوان ناوو سەرچاوە(واتە وێنەی بیستراور م، ێ، ز)و بابەتەکە(مێز) پەیوەندییەکی راستەخۆ نییە هەروەك خاڵەکانی ژێر سێ گۆشەکە دەست نیشانی دەکات، ئەوەی کە لەسەرسێ گۆشەکەیە یەکسەر دەمانگەیەنێتەوە بە شێوەیەکی راستەوخۆ بۆ پەیوەندییە دووانەکان ( الثنائیة) کە (دی سۆسێر) بەر لەچەند ساڵێك باسیانی کردووە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە سێ گۆشەکەی (ریچاردزو ئۆگدین) هەندێ وردی تێدایە لەپەیوەندی نێوان چەمكو شتەکاندا" بەڵام هیچ شتێکی نوێی نەخستۆتە سەر تیۆرییەکەی (دێ سۆسێر) لەبواری ناولێنراودا، هەروەها بۆ واتاسازی زمانی، هیچ شتێکی بەنرخی زیاد نەکردووە.

سەرەڕای ئەمەش تا ئێستا کەس نەیتوانیوە پێناسەیەکی وردی زمانی بۆ ناولێنراو دابنێ، بەتایبەتی ئەوانەی پشتیان بە بۆچوونی سیانی نێوان نیشانەی زمانی( ناو، ناولێنراو، سەرچاوە) بەستووە.



ئولمان (Ullman) دوای ئەوەی کە لەکورتەیەکی زانستی واتاسازی فەرەنسی ساڵی **١٩٥٢**، وەرگێرانێکی سادەو گونجاوی بۆ زاراوەکانی سێگۆشەی " ریچاردزو ئۆگدین " پێشکەش کردو دوایی ئەوەی کەباسی پەیوەندییە جیاوازەکانی نێوان هەر بەشێك لەبەشەکانی سێگۆشەکەی کرد ئەمەشی خستە سەر کە " شت" لەوانەیە دووربێت لە رۆنانی ناوەوەی وشە، هەروەها نیشانەی زمانی بەتەواوی وەك دێ سۆسێر لەدوو زاراوەدا کورت کردەوە: ناو"دال" ناوی شت کە رونانی ناو رۆدەنێتو ناولێنراو"مدلول" کە واتاکە دەردەخات و ئەو پەیوەندییەیە کە ئەم دوو زاراوەیە بەیەکەوە کۆدەکاتەوە.

### ٤- چەمك و نرخ:

هەر چەندە "دی سۆسێر " زانستی واتا سازی لە کتێبەکەیدا (چەند وانەیەك لە زمانەوانی گشتی ) روون نەکردۆتەوە کە لە ساڵی **١٩١٦** دەرچووە، بەڵام بە دۆزەرەوەی بیرەکە دادەنرێت ، کە سەرچاوەی فەرهەنگسازی و واتا سازی رۆنانییە .دەبێ نرخیش بە چ شتێکەوە بەسترابێتەوە؟ نیشانەی زمانی کرۆکێکە لە ناوو ناولێنراو پێك هاتووە، هەر وەك زمان لای "دی سۆسێر" کە بە سیستەمێکی بنجی رووت دادەنرێت.دەتوانین لەم بارەوەبپرسین : لەچ شتێك دا ناولێنراوی ( مدلول ) دانەیەکی زمانی لە نرخەکەی جیادەکرێتەوە .

بۆ روونکردنەوەی جیاوازییەکە دی سۆسێر پەنای بردەبەر بەراوردکردنی لەگەڵ یاری شەترەنج و بەردی ئەسپی وەك نموونە وەرگرت و تێبینی کردو

گوتی : دەكرێ ئەم پارچەیە ( ئەسپە ) بگۆرینەوە بە پارچەیەكی تری وەك پارچە دراوێك یا قوفلێك یا بازنەیەك ....هتد . تەنانەت ئەگەر لێكچوونیش نەبێت لە نێوان ئەو پارچانە ؟ بەپیی ئەوەی كە ئەسپەكە خۆی هیچ شتێك نانوێنێ ئەوەندە بەسە بۆ دانانی نرخەكەی بەپێی شوێن و بارودۆخی بەنیسبەت ئەو پارچەیەی كە لە گەلی گۆراوە ئەوەی ئەو نرخەێ پێ بەخشیوە بەرانبەركردنیەتی لەگەڵ پارچەكانی تری یارییەكە .

هەمان شتیش لەسەر زمان پیادە دەكرێت، (بۆ نموونە نرخی زاراوەیەكی زمانی بەپێی شوێنی كۆمەڵە یاسایێك دا، كەزمانەكە پێك دێنێت، سەرهەڵدەدات یان دادەنرێت، تۆری بەرامبەركردنی هێماكان لەناو خۆیاندا.)

بەڵام ناولێنراو تەنیا شێوەیەكی نیشانەیە، بۆ روونكردنەوەی جیاوازی نێوان واتاو نرخ لەسەر ئاستی زمانەوانی،"سۆسێر"پشتی بە كۆمەڵێك نموونە بەستووە لەوانە:

أ- وشەی مەڕ"Mouton" لەزمانی فەرەنسی" Sheep" لە زمانی ئینگلیزی دا هەمان واتا دەگەیێنن، بەڵام هەمان نرخیان نییە. چونكە لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی"Motion" بەو پارچە گۆشتە دەوترێ كە ئامادەیە بۆ خواردن، لەكاتێكدا وشەی" Sheep"بەو ئاژەڵە (مەڕ) دەوترێت كە لەناو كێلگە دابێت.

نرخی جیاوازی"moution" و"sheep" لەئەنجامی بوونی دوو زاراوی جیاواز لەزمانی ئینگلیزی، كە بۆ دەربڕینی ئەو راستیەی كەبەیەك زاراوە لەزمانی فەرەنسی هاتووە، سەری هەڵداوە.



ب- لەناو زمانێك دا وەكو زمانی فەرەنسی بۆ وێنە چەندین هاوواتا هەن وەك" redouter" ترسان "crainder" و هەست بە ترس كردن" avoir peur"، سنورو بەكارهێنانی ئەم هاوواتایانە بەهۆی جێگۆركێیان لەگەڵ یەكتری دەست نیشان دەكرێ، نرخیان لەرێگای نەگونجانیان لەگەڵ یەكتر سەرهەڵدەداتو پەیدا دەبێت.

ئەگەر یەكێ لە زاراوەكانی وەك" redouter" نەبێت ناوەڕۆكەكەی دەبێ لەنێوان دوو زاراوەكەی تر دابەشكرابێت. لەوانەشە ببێتە مایەی دەوڵەمەندكردنی زاراوەیەك، بە سوودوەرگرتن لە كاریگەری زاراوەكە لەسەر زاراوەكانی تر.

بۆ نموونە هەرچەندە لەرووی مێژووییەوە هیچ پەیوەندییەك لەنێوان دیواری روخاو "un murdécripi"و پیرەمێردێكی بێ تاقەتو پەك كەوتوودا" un vieillarddécripit" نەبێت، بەڵام خەڵك وەكو زاراوەیەك دایاننـاوە، توخمی نوێ خراوەتە ناو " décripi" لەئەنجامی هەڵسوكەوتی لەگەڵ "décripi" دا.

ج- هەر لەگەڵ زمانی فەرەنسی دا دەبین، ئەمجارە لەگەڵ دۆخی رێژەی فەرمانـدا، ئەگەر رێژەی كاری بڕۆ " marche"و بڕۆن "marches"، رۆژێك لەرۆژان لە بەكارهێنان كەوت، دەبنین نرخی با بڕۆین"marchons" گۆرانی بەسەر دادێتو هەردوو رێژەكەی تر بەخووە دەگرێت.

بەهەمان شێوە لە دیدو بۆچوونی " سۆسێر" دا شیكردنەوەی واتایی تەنیا هەوڵ نادات بایەخ بە یەكەی واتایی زمان بدات، بەڵكو لە هەمانكاتدا بایەخ بە نرخەكەشی دەدات ، واتە ئەوە پەیوەندی و واتایانەی كە دەیانپارێزی لەگەڵ واتاكانی تر لەسەر ئاستی سیستەمی زمانیدا.

**ب- بابەتی واتا سازی:**

**١- وشە:**

**أ- وشە وەك بابەتێکی بەرایی واتاسازی:**

تێبینی دەکرێ کە بەلای زۆربەی خەڵکی بابەتی یەکەمی واتاسازی وشە بێت .واتاسازیش رۆڵێکی بنجی دەبینێت لە دەستنیشانکردنی یاسای رێکخەر بۆ واتای وشەکان لە ناو خۆیاندا، ئەو گریمانەیەی کە دەکرێ لەسەرئەم رێرەوە دابرێژرێت بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

لەراستیدا چەندین بنیاتنان لە سەر ئاستی رۆنانی دەنگسازی" la phonologie "ئاستی وشەسازی "morphologie"وئاستی رستە سازی "Syntaxique" هەیە، زمان یەکەیەکی تەواوە، بۆچی دەبێ ئەم ئاستانە لە رووی واتاسازییەوە جیاوازبن؟

کاتێ ئەم گریمانەیەم دانا، لێکۆڵەرەوەکان لە واتاسازی دا رووبەرووی پێچەوانەیەك بوونەوە.

لەلایەك هەندێ لە زمانەوانەکان باوەریان بە یاساکانی رێکخستن هێنابوو ،هەرچەندە دانەی زمان و ناوەرۆکەکەی (واتاکانی) وشەکان- بێگومان- لەیەکتری دانەبراون لە مێشکماندا.

لەلایەکی تر بەشێکی زۆری زمانەوانان وای بۆ دەچن کە گێرە شێوێنیە وابیر بکەینەوە کە دەکرێ لە رێگای شیکردنەوەوە بگەینە تەواوی نموونەی رۆنانی ئەم سیستەمە لە واتا، لە رێگای فەرهەنگەوە (دانەی زمان).

بە واتایەکی تر ئەگەر تارادەیەك دەستنیشانکردنی هەندێ بەش لە دانەکانی زمانێکی دیاریکراو کارێکی ئاسانبێت ، وەك ئەو زاراوانەی کە



گوزارشت لە خزمایەتی دەدەن، یان رەنگەکان ،یان پلەی سەربازی....هتد.

بەڵام - تائێستاش- دۆزینەوەی رێگایەك بۆ رێکخستنی دانەکانی تری زمان کارێکی ئەستەمە، کە ئەمانەش بەشێکی زۆری زاراوەکان پێکدێنن کە ئێمە دەتوانین بەکاریان بهێنین. بەشێکی کەمیان ناگونجێ لەگەڵ ئەو رێگایانەی کە تا ئێستا بەکار دێت لەگەڵ بەشە لێکدراوەکان.

بۆ نموونە ئەوەی کە بەرێزمانی سوننەتی ناونراوە (صرف) وشەسازی یان رۆنانی وشە لەسەر "بنەمای پێشگر و پاشگر و بەردەوام گەرانەوە بۆ سەر بنجی وشەکە، زنجیرە بارێکی بەردەوامە بۆ نموونە :

| | |
|---|---|
| boulange-rie | enseign-er |
| -ons | characute – |
| -ant | armure – |
| -ement | verre - |
| Etc… | etc….. |

| | |
|---|---|
| ensign- ous | casse-tête |
| chant - | -noisettes |
| cri - | -pied |
| dirige- | -pipe |
| etc... | etc.. |

یان لەگەڵ کۆمەڵەی داریژراوەکانی "able" یان لێکدراوەکانی " in" ، "super"،" ment" ...هتد، ئەمەش دوبارە دۆخێکە لە کێڵگەی دارشتن بۆ بەشێك لە دانەکانی زمانی کە گوزارشت لە ئاژەڵە خۆماڵیەکان دەکاتەوە، بەرامبەر بەوەی کە "جۆرج مۆنانGeorges Mounin" لە کتێبەکەیدا کلیلەکانی واتاسازی( ۱۹۷۲- لا ۱۳۲) سەلماندویەتی ئەو تێبینی یانەی کە لەم زنجیرەیە هەڵدەهێنجێنرێت، یان دەرەنجامی ئەو زنجیرەیە ئەوە دەردەخات کە بەلایەنی کەمەوە بوونی بنیادی هەندێ یەکەی فەرهەنگی- ئەو ڕێکخەرە فەرهەنگیو واتاییانە لەو دێتایانەو سەرهەڵدەدات کە بابەتی زمانی رووتن: ناولێنراو یان روخساری وشەکان نرخی سەرەکی توخمی شیکردنەوەن، لەکاتێکدا ئەو قورساییەی (ئەو گیرو گرفتانەی) کەرووبەروومان دەبێتەوە لە راستیدا دەکەوێتە سەر رۆنانی ناولێنراوی یەکەکانی زمان، چونکە ئێمە وای بۆ دەچین کە ئەم قورساییە پەیوەندی بە رۆنانی ناولێنراوەکانەوە هەیە، هەروەها پەیوەندی بە نیسبەت رۆنانی هاوبەش(دوال) کە لەگەڵ ڕێکخستنە لێڵەکەی ناولێنراوەکانی ئەو یەکەزمانیانە دەگونجێ.

لێرەوەدا ئەم خشتیە بە نموونە دەهێنینەوە.



| Nom Specifique | Ane | Cheval | Mulet | Boeuf | Chevre | Porc | Cochon | Chat | Chien | Lapin | Poule | cznard |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Femelle | Anise | | Mule | | Chevre | | | Chatte | Chieme | Lapine | Poul | Cane |
| Jeune | Anon | | | | Chevreau | Porcelt pourceau | Cochonnet | Chaton | Chiot | Lapereau | Poulet | Canetot |
| Panyrution | | | | | Cheverler | | Cochonner | Chatonner | Chicenner | Lapiner | | |
| Gardien | Anier | | Muletier | Bouvier? | Chevner | Porche | | | | | | |
| Derivation Adjectable | | Chevalin | Mulasier | Bovin? | | Porch | | | | | | |
| Local delevage | | | | Bouvene | Borcheric | Cochonnier | | Chenil | Lapiniere | Poullailler? | | |

N.B: le? Indiq
ue les derivations non productives ou peu productives don't on peut se demander si elles sont percus generalemment.

تێبینی:

نیشانەی پرسیار لەو خشتەیەدا بۆ وشە دارێژراوە بەکار نەهاتووەکان یان زۆرکەم بەکارهاتووەکان دانراوە، کە دەکرێ بپرسین بە شێوەیەکی گشتی باسکراون یان نەء .

لەبەر ئەوەی زانستی واتاسازی یەکەم جارو پێش هەموو شتێك بایەخو گرنگی بە توخمە فەرهەنگی یەکانی زمان دەدات، بۆیە ئەو بۆچوونە بۆ واتاسازی نزیك دەبێتەوە لەهەندێ لایەنەکانی زانستی وشە( یەکەکانی وشە) واتە لە لێکۆڵینەوەی بنەماکان و رێگاکانی فەرهەنگی. (ئەمەش بە تەکنیکی ئامادەکردن ناسراوە بۆ دەستنیشانکردنی فەرهەنگەکانی زمان).

لە راستیدا دەتوانین گریمانەی ئەوە بکەین کە زانیاری پتەوی رێژەکانی ئامادەکردنی ناولێنراوەکانی وشە لەوانە یە بەرەو چاککردنی فەرهەنگەکانی زمانمان ببات، بەڵام پشت بەستن بە وشە وەکو یەکەیەکی شیکردنەوەی واتا بەبێ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کێشەو گیروگرفت ئەنجام نادرێت.

ب- وشە دانەیەکی شیکردنەوەیە: ئەگەر لەم وشانە وەك" مێز" "table"و" نووسینگە""bereau" وە کورسی " chair" هەروەها" لە" و" بە" و" لەسەر" "par" و لەبەر لە جیاتی" pour" و" لەبری" et" وەردەبینەوە، هەست بەوە دەکەین کە سێ وشەی یەکەم لەڕووی واتاکانیانەوە بەتەواوی وەکو سێ وشەکەی دواتر نین، لێرەدا ئەو جیاوازییە دەردەکەوێت کە زمانەوانەکان لەکۆنەوە هەستیان پێ ی کردووە، هەندێکیان باسیان لەوشەی پڕو وشەی بەتاڵ کردووە، هەندێکی تریان باسی وشەی پڕو وشەی ئەرکیان کردووە، ئیتر هەر بەم جۆرە..هتد.



هەرچۆنێك بێت زاراوەکان بەکارهاتووە، بەڵام جیاوازییەکە لە سروشت دا هەر زۆرە، ئەمەش رێگا دەدات کە مامەڵە لەگەڵ ئەم دوو جۆرەدا بکرێت.

ئێمە دەتوانین قسە لەبارەی واتای فەرهەنگیو واتایی رێزمانی بکەینو ئەوەش بکەینە پێوەرێك بۆ جیاکردنەوە.

لەراستیدا فەرهەنگ پەیوەستە بەلایەنێکی ژمێردراوی سنوردار، هەر رۆژە وشەیەکی فەرهەنگی نوێ سەرهەڵدەدات، لەلایەکی ترەوە پەیوەندی بەهەندێ بەشی داخراو هەیە وەك (ئامرازی پەیوەندی کە تارادەیەك داخراون). ئەم بینەو بەردەیەش هەر بەردەوام دەبێت.

گیروگرفتی دووەم بەهۆی ئەوەی کە وشە یەکەیەکی دیاری کراوە بەئاشکرا، سەرهەڵدەدات بۆ نموونە:

Mappe du monde /mappemonde ئاساییە کە وشەکە ( وشەی یەکەم) وەکو یەك وشە باسی لێدەکرێت، بەڵام ئەم بارە لەگەڵ وشەی"mappe du monde" ناگونجێ، هۆیەکەشی بۆ ئەوە دەگەرێتەو کە وشە رێکەوتنە، واتە کۆمەڵ لەسەری رێك دەکەوێت، رێك کەوتنی زاراوەی زمانی نووسراوو جیاوازی نێوان وشەکان تەنیا لە بەرکارهێنانداییە واتە " رێکەوتن"

توخمێکی تر دەچێتە سەر ئەو گیروگرفتانە باسیان لێوەکرا، ئەویش ئەوەیە کەهەندێ وشە روون و ئاشکرانین، کەچی هەندێ وشەی تر زۆر روونو ئاشکران، وشەی روونو ئاشکرا ئەو وشانەن کەبەگشتی واتاکانیان بەنیسبەت توخمە بنچینەیەکانیان دەست نیشان کراوە. بۆ نموونە لە وشەی " maisoniette" کە بچووککراوەی خانووە پاشگری "ett e" گوزارشت لە

بچووك كردنەوە دەكات ئەمەش یاسایەكی گشتی نیە چونكە"tablette" بۆ مێزی بچووك بەكار نایەت، كەواتە" ناكرێ بەئاسانی دەستنیشانی وردی بەشە گرنگەكانی وشە بكرێت.

لە هەندێ وشەی تردا كە لە توخمی پێكهێنەر پێك نەهاتوون خودی وشەكە گوزارشت لەخۆی دەكات وەك مێوە"fruit"و گوڵ" fleur" و باران"pluie" ...هتد.

لە راستیدا لە دەستنیشانكردنی وشە وەك یەكەیەك بۆ شیكردنەوەی واتا كۆسپێكی تر هەیە ئەویش لە بوونی كون و بۆشاییە لە زماندا ئەمەش رامان دەكێشی بۆ درێژ دادری ئەمەش وەكو ئەو رێگایەیە كە زمانی فەرەنسی بۆ بەچكەی هەندێ لە ئاژەلەكان بەكاری دەهێنی، كە ئەمەش رێك وپێك نییە وەك: پشیلە "chat." "فەرخە پشیلە" "chaton" و " گوجیلە " "chiot" شێر"lion" فەرخە شێر"lionceau" . ئەم وشانە بەرامبەریان هەیە لە بچووك كردنەوەدا كە چی هەندێ وشەی تر هیچ زاراوەیەكیان بۆ ئاژەلی بچووك نییە وەك:" البرنیق"""hippopotame،l" و پلینگ " leopart" و "كركدن" یەك شاخە "lerhinoceros" بۆ بچووك كردنەوەی ئەم جۆرە وشانە دەبێ پەنا بەرێتە بەر درێژ دادری وەك فەرخە پلینگ "bebeleeopart" ...هتد

لێرەدا دوو یەكەی واتاییمان هەیە بۆ دەربرینی راستییەك بەڵام لە بارەی رێژەی زاراوەی دەربرینی وەك:" هەستی بە ترس كرد"avoiroeur" دەبینین دوچاری هەمان گیروگرفتی نموونەی پێشوو دەبێتەوە. دەرئەنجام دەتوانین بڵێین، ئاسان نیە بڵێین وشە دەتوانێ ببێتە یەكەیەكی شیتاڵكردنی واتایی، تەنانەت



ئەگەر واتا ئاسانو فەرهەنگ ناسانیش بە ئاسانی بەكاریان هێنابێ، بۆ گەیشتن بە باسێكی لەبار بۆ واتا، پێویستە هەندێ لەو بنەمایانەی كە دەربارەی گیرو گرفتەكان، كە پێشتر ئاماژەیان بۆ كرا، هەڵبژێرین.

**٢- رستە:**

**أ- رستە وەك بابەتی یەكەمی واتا:**

بەلای هەندێ واتاناسان، هەروەك پێشتر دیتمان، واتا پێویستە پێش هەموو شتێك بایەخ بە وشە بدات، كەچی هەندێكی تر بە لایەنەوە ئەگەر واتای وشەكان گرنگی خۆی هەبێتو لە بەشەكانی تر باشتر بێت، پێویستە ئەم لێكۆڵینەوانەی دەربارەی واتا دەكرێت لەسەر ئاستی دەربڕین بێتو لەگەڵیدا بگونجێت.

بەواتایەكی تر ئەو شتەی كەدەبێتە بنج لە واتادا ئەو رێگایە یە كە واتای وشەكانی تێدا رێز دەكرێت بۆ رۆنانی واتای رستەیەك. بۆ نموونە ئەگەر رستەیەكی وەك ( پیاوەكە پارەی دا بە كوڕەكە) وەربگرین دەبینین لەم گوتنە چەند دانەیەكی فەرهەنگی بنجی گوتنەكەمان پێك دەهێنێ كە(منداڵەكە پارەی دا بە پیاوەكە)یە. بەڵام واتای رستەی یەكەمو دووەم لێك جیاوازن، هەروەها ئەم بۆچوونە لەسەر ئاستی رۆنانی سەرەوەی زماندا كێشەی پەیوەندی نێوان رێزمانو واتامان بۆ دەخاتەڕوو.

**ب- رۆڵی واتای رستە:**

لە ماوەیەكی نزیك دا تارادەیەك، لایەنگرانی واتای رستە لە سۆنگەی ئەوەی كە رۆڵی واتا لەسەر دۆزینەوەی پێكهاتەی واتای گشتی گوتن

دەوەستێت و لە مانای یەکەکانی فەرهەنگییەوە سەرهەڵدەدات، بۆ ئەم مەبەستە چوون کە کێشەکە بەستراوەتەوە بە تێبینیو شیکردنەوەی ئەو گوتنانەی کەبەراستی قسەکەران بەپێ ی کۆمەڵێك یاسا دەربڕیان دەبرن .

لەماوەی چەند ساڵێکدا توێژینەوەی زۆر فراوان لە بواری واتا لەلایەن توێژەرانەوە پێشکەش کراوە، وەکو ( جیرۆلێد کاتس فودور) " Jerrold Katzet fodor" لە ساڵی ١٩٦٣ لە وتارێکدا بەناوی " ڕۆنانی تیۆری واتا "The structure of semantic"،ئەم وتارەش وەرگێڕدراوە بۆ زمانی فەرەنسی لە ساڵی ١٩٦٦-١٩٦٧ لە ژێر structure dune theroie francais semantique avec application au " ڕۆنانی تیۆری واتاییو پیادە کردنی لەزمانی فەرەنسیدا.

ئەم تیۆرە چوار ڕۆڵی بۆ تیۆری واتایی داناوە:

**ڕۆڵی یەکەم:**

دۆزینەوەی لێڵی (تەمو مژ) نارێزمانی، وەك بۆ نموونە بلێین :( لیستەکە تەواوە La note est justc) لە چوارچێوەی ڕێزمانەکەی چۆمسکی یەوە ڕۆنانی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە خوارەوەیە:



P

SN SV

ART N V adj

La note est justc

**ئامراز ناو کار ئاوەڵناو**

ئەوەی ( کاتس‌و فودەر) لەم بارەدا تێبینیان کردووە ئەوەیە کە تەنانەت ئەم رستەیە ئەگەر تەنیا یەك رۆنانی هەبێت، ئەوا دیسان ئەم رستەیە رستەیەکی لێڵە، بەلاّم ئەم کارە جیاوازە ئەگەر پەیوەندی بە نۆتی مۆسیقا یان نیشانەکانی ژمێریارییەوە هەبێت.

زانستی واتا سازی لە چوارچێوەی ئەم نموونەیەدا، لێڵی‌و نارێزمانی دەدۆزێتەوە.

**رۆڵی دووەم:**

دەست نیشانکردنی ژمارەی لێکدانەوەکانی رستە

لە رستەیەکی وەك:( لیستەکە راستە، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشا، زۆر گرانە( La note est juste maisc'est qunad meme trop cher).دەکرێ بۆ قسەکەر ئەم نموونەیە روون بکاتەوەو تەمو مژیەکەی لەهەندێ بەشەکانی رستەکە برەوێنێتەوە، ئەمەش بە یارمەتی بەشەکانی تردەبێ، لێرەوە ژمارەی لێکدانەوەکانی گونجاوی رستەکە دەست نیشان دەکرێ.

**رۆڵی سێیەم:**

دۆزینەوەی نامۆکانی واتایی:

رستە وەکو " هونەری وێنە بێ دەنگە" بۆ قسەکەری ( فرەنکۆفۆنیfrancofhonie) [1] بێ گومان رستەیەکی نامۆیە( واتە ئەم رستەیە نامۆیەکی واتایی دەنوێنێ) بەلاّم قسەکەری بیانی لەهەموو بارێکدا

١- قسەکەری فەرەنسی یان ئەوەی بە " متفرنس" ناسراوە.



ناگاتە ئەم راستیە، بەپێی بۆچوونی (کاتس‌و فۆدور) ئەمە پەیوەندی بە تیۆری واتایی‌و توانایی دۆزینەوەی  جۆری نامۆییەکەوە هەیە.

**رۆڵی چوارەم:**

دورست کردنی هەندێ رستە چ ئەو رستانە لێکدانەوەیی بێت یا نالێکدانەوەیی (تفسيرية ام غير تفسيرية). هەر قسەکەرێکی فرەنکۆفۆنی کارامەیەکی هەیە بۆ رۆنانی هەندێ رستە، جا ئەو رستانە لێکدانەوەیی بێت یا نالێکدانەوەیی بۆ رستەیەکی تر.

بۆ نموونە وای بۆ دەچین رستەیەکی وەك : ( لیستەکە تەواوە، یا ئاگاداریيەکە تەواوە) "La note est juste" ئەمە نامەیەك بە خۆدە دەگرێت کە لەناو نامەکەی قسەکەردا هەیە.

لەم رووەوە لەدوای چەند سالێك توانیمان دەست نیشانی هەندێ سیمای واتایی بکەین کە تیۆری واتایی بەهۆی ئەمانەوە توانی پێگەو بایەخێك بگەرێنێتەوە بۆ:

- هەرچەند راقەی لێڵی‌و نامۆیی و لێکدانەوە، یان نوێ کردنەوەی ژمارەی لێکدانەوە لە بارەکانی رستە زۆر بێ ئەوەندە تیۆری واتایی بایەخ دەدات بە دەربڕینە هاودژەکانی وەك:

خۆشکە شوونەکردووەکەم شووی بە رەبەنێك کردووە.

- هەروەها بایەخ بەپەیوەندییەکانی نێوان دوو دەربڕینەکە دەدات.

وەك زۆربەی قوتابیەکان نەیانتوانی وەلاّمی پرسیارەکە بدەنەوە تەنیاهەندێکیان لە چەمکی پرسیارەکە گەیشتن. دیسانەوە بایەخ بە پەیوەندی گرتنەوەیان گریمانەکانی دەدات وەك:





ئەحمەد چەند لە  کیباك مایەوە؟ (Quebec)

لەوانەیە ئەحمەد بۆ ماوەیەك لە کیباك مابێتەوە. بە بۆچوونی هەندێك، واتا سازی دەتوانی ئەم جۆرە بارانە بەپێ ی مل کەچی، بە زۆری بۆ لۆجێك لێکبداتەوە،  هەروەها دەبێ دوو جۆرە راستی لێك جیابکرێتەوە:

- راستیە پێویستەکانی بنیات نراوە لەسەر پەیوەندی لۆجیکی.
- راستیە لەوانەکانی پەیوەنددار بە جیهانی واقعی یەوە.

بۆ نموونە دەڵێین: (هەموو زیندووەکان مردوو نین) ئەونموونەیە بۆ راستی لۆجیکی یان راستی شیکردنەوەی یە، بەپێچەوانەی گوتنی: ( هەموو زیندووەکان بەختەوەرن) ئەمەش دەوەستێتە سەر راستی تێبینی کراو نەك دەست نیشان کردنی دانەکانی رستە، کە بە راستی رۆنانی (دارِشتن) ناو دەنرێت.

لەو بارەی دوایی رستەکە دا دەڵێین کاتێك ئەو رستەیە لەرووی رۆنانەوە راستە ئەگەر دوای گەرانو پشکنین بەدوای راستی بۆ مان دەرکەوێ کە هەموو زیندووەکان بەراستی بەختەوەرن.

لە کاتێکدا، ئەگەر لەشیکردندا پشت بەم نموونەیە لە شیتاڵکردن دا ببەستین کە رەزامەندی بە باوەر بوون دەگرێتەوە بەوەی کە واتای زمانی سروشتی مرۆڤەو دەکرێ تەنیا لەسەر لێکدانەوەی پەیوەندی نموونەی لۆجیکی دابنرێت.

**ج- سەختی رۆڵی شیکردنەوەی واتایی:**

هەروەك بەرچاومان کەوت دەست نیشانکردنی وردی مەبەست لەواتای وشە کارێکی ئاسان نییە، سەرەڕای ئەمەش، واتا ناسان لەسەر بابەتی یەکەمی



واتایی رێك نەکەوتوون( واتای وشەکان یان واتای رستە). ئەوانەی کە وشەیان هەڵبژادووە وەك یەکەیەکی شیکردنەوە رووبەرووی چەندین کێشەی گەورە بوونەتەوە، لەکاتێکدا ئەوانەی کە بایەخیان بە رستە داوە لایەنی جۆراو جۆریان داوەتە پاڵ تیۆری واتایی.

سەرەڕای ئەو کێشە چارەسەر کراوانە، ئەوەی کە رۆڵی واتایی ئاڵۆز دەکات لەراستیدا لەوەدایە کەزمان زۆر جار دەتوانێ بەهۆی رستەی پرسیارەوە پەیوەندی بکات یان مەبەستێك رابگەیەنێت، ئەوەی کە زۆر جار رستەکە بەرەو داخوازی دەبات لە جیاتی گواستنەوەی هەواڵ ئەمەش کاری رێژەی فەرمانە کە هەرگیز ناتوانین بلێین تەنیا دەبێتە مایەی گواستنەوەی هەواڵ.

ئەم نموونەی دەربڕینەش لەرووی واتایی یەوە بۆ فەرمان دان بەکار هاتووە" ئەم کارەم بۆ دەگەرێنییەوە لەماوەی دە خولەك؟" سەرەڕای ئەمەش زۆر جار ئێمە گوتن بۆ ئەوەی کار لەخەڵکی بکەینو قەناعەتیان پێ بکەین بە کاردەهێنین نەك هەر بۆ ئاگادارکردنیان.

هەندێ وشە بەکارهاتووە بۆ هیچ نیە بەڵکو بۆ ئەو کاریگەرییە یە کە لەوانەیە دروستی بکات بەتایبەتی لەبواری رامیاری، بۆ نموونە مامەڵە کردن لەگەڵ یەکێك لە ئەندامانی حزبی رکە بەر "فاشی یان هاریکاری دوژمن دەکات" کە تەنیا مەبەست سوکایەتیو نارەزایی دەربرینە.

دەبێ ئێمە چۆن لەگەڵ ئەم جۆرە شیکردنەوەی واتاییە هەڵسو کەوت بکەین یان دەبێ هەڵوێستمان لەگەڵ ئەم جۆرە نموونانەدا چۆن بێت؟

گاڵتە جاری لە بەکارهێنانی زمان ئەمەش دەخرێتە سەر ئەم گیرو گرفتانە، بۆ نموونە ئەگەر بە کەچەلێك بلێین: سەرتاشەکەت کێ یە؟

زمان چۆن چارەسەری ئەم جۆرە بەکارهێنانە زمانیانە دەکات؟

**د- زمانو تێروانینی جیهان:**

بۆ زیاتر قوولّ کردنی چەمکی " بـەها" لای سۆسـێر، لـە وشـەی زمـانی ئینگلیزی " ترێ" grape" دەکۆڵینەوە دەبنین بە واتای میوەی تازە یان تـرێ بەکارهاتووە لەکاتێك دا وشە"raisin" بەواتای مێوژ بەکار دێت.

بەڵام لە زمانی فەرەنسی تەنیا یەك وشە بەکاردێت کە گوزارشت لـەوجۆرە بداتەوە ئەوەش" raisin"ە.

زمانی ئیسپانی لایخۆی جیـاوازی نێـوان ماسـی زینـدوو( ئـەوەی کەلـەناو ئاودایە)و ئەو ماسییەی کەئامادەیە بۆ بەکارهێنان دەکات ئەویش بـەهۆی دوو وشەی " Pescado،Pez " کە ئەمەش بە پێـچەوانەی زمـانی فەرەنـسی یـە کەتەنیا یەك وشە ی هەیە بۆ ئەم مەبەستە ئەویش " ماسی" "Poisson"یە.

دەتـوانین بلّـێین زمـانی فەرەنـسی لەهـەردوو حالّـەتی "raisin" و "poisson" یەك وشەی هەیە کە گوزارشت لە هەردوو جۆرەکە دەداتەوە.

بەم پێ یە دەتوانین بگەینە ئەو دەرئەنجامە کە وشەی فەرەنـسی "خورمـا" "Palmier" شەست چەمك دەدات بە دەستەوە هۆیەکەش لەوەدایـە کەزمانـە ئەفریقیەکان شەست جۆرە خورمایان هەیە.

هەمان کێشە لەگەلّ وشەی " بەفر" "neige" دایە، ئەم زاراوەیە لەزمانی فەرەنسی دا پەیوەسـتە بـە بیرێـك بـەلاّم لای ئەسـکیمۆ چـەندین وشـە هەیـە بەرامبەر بە وشەی بەفر بۆ نموونە بـەفری کـەوتوو، بـەفری سـەر زەوی، بـەفری بەستوو، بەفری تواوە، بەفری تۆزاوی ..هتد ئەم کێشانە سەرنجمان بۆ وردکردنی هەندێ راستی رووت لەهەر زەمانێکدا رادەکێشێ ئەمەش بەگریمانـەی" سـابیر وورف Sapir whorf" ناسراوە یان زۆر بەساکاری بـە گریمانـەی "Whorf" دەتوانێ گوزارشت لە رۆنانی زمانی سنوردار ،یان پێشتر دیاریکراو بکـات، کـە ئاراستە دەکات هەروەها تێروانینمان بۆ جیهان رێکتر دەخات.

هەنـدێ جـار وا روودەدات کەبـەکارهێنانی هەنـدێ وشـەی دیـاریکراو ئاراستەمان دەکات یان هەلسو کەوتمان بۆ بۆچوونێکی دیـاریکراو دەبـات، بـۆ نموونە ئەو کەسانەی کە لەنزیك تانکی نەوت یـان بـەنزین کـار دەکـەن زیـاتر خۆیان بۆ مەترسی یەکە ئامادەدەکەن بە پێچەوانەی ئـەوەی کەلەسـەر تـانکی یەکان نووسرابێت بەتالّن، دەبینین رەوشتو هەلّسو کەوتیان زۆر جیاوازە لەگەلّ ئەوە کەی پێشوو(واتە هێمنو ئارامن)

ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کەلەسەر تانکی یـەکان نووسـراوە بـەتالّن کـە ئەمەش وا پێشان دەدات کەترسەکە نەماوە لەکاتێکـدا تـانکی یـە بەتالـەکان ترسناکترن چونکە پڕن لەهەلّمی بە توانا بۆ تەقینەوە.

ئەوەی "ورف Whorf" مەبەستی بـوو گـشتاندنێکی زیـادە رۆییـە، کـە بینینی جیهانی لە زمانە هیندی ئەمریکیەکان لەگەلّ بۆچوونی میللـەتانی تـر ناگونجێت، یان میللەتانی تر ناتوانن وەکو هیندی ئەمرکیەکان بروانـنـە جیهـان. زۆر هەلّەیە وابیر بکەنەوە کەزمانی فەرەنسی ناتوانێ گوزارشت لە شـێوە، یـان حالّ، وەك کاتی بەردەوامیو کاتی بەیاریدەی ناو بکات.

بەلاّم ئێمە هەست بە بوونی شێوە دەکەین، یان حالّ لەهەندێ زمانانی تر بە ئاشکرا لەگەلّ ناو دا دەبنینن وەك ئەوەی لەگەلّ کاردا بەرچـاو دەکـەوێت، وەك وشـەی خـانوو وکـاری رۆیـشتن، ئەمـەش" وورف" بـۆ گرنگـی وشـەکان دەگەرێنێتەوە.

ئەگەر بەوردی ئەو شتانەی کە لـەزمانی فەرەنـسی روودەدات شـیبکەینەوە هەست بەوە دەکەین کە پۆلی رێزمانی (یاسا) بۆ شێوە یا حالی هاوبەش لەگەڵ کاردا لەهەندێ لە ناوەکاندا دەدۆزینەوە، شێوە یان حال دەبێتە ناو، لەو وشـەو دەستەواژانەی وەك: تۆ، گەنم، تازە لەدایکبوو، دەستگیران..هتد. هەروەها چۆن دەتـوانین نکـوڵی لـە نیـشانەی نـاوی کـاتی بکـەین وەك:زاوای ئاینـدە، زاوا، دایکێکی لاو، دایك،..هتد.

هەموو شتێك وامان لێ دەکات کە باوەڕمان بەوە بێت کە بینـینی جیهـان وەك دەرکــەوتنی لەبەرچــاو —تایبەتــە بەزمانــەکانی هێنــدی ئــەمریکیو هەمووشیان بەنیسبەت زمانی فەرەنسی ئاسانە گەیشتن پێیـان بـەو جیاوازییـە نزیکەی کە زمانی فەرەنسی بەهۆی هەڵبژاردن لە ئاستی فەرهەنگدا گوزارشت لەوە دەدات کە زمـانی " هـوبی" Le hopi" لـەرێگای پەیوەسـتکردنی بـە یاساکانی زمانەکە دەری دەبڕێ.

ئەگەر ئەو بابەتەمان قەبوڵ کرد، دەتوانین زمانەوانێکی هـوبی" hopi" وا ببینین ئەگەر زمانی فەرەنسی لەژێر رۆشنیایی زمانەکەی خۆی شـیبکاتەوە — بەبێ شك- بینینی جیهانی بەشێوەیەکی زۆر نامۆ هەڵـدەهێنجێ، ئـەوەی کـە لێـرەدا پێـی دەگـەین داکـۆکی کردنـە لـە رووداوێکـی زۆر ناسـراو لـەبواری زمانەوانیدا، ئەمەش ئەگەر هاتوو زمان دابەشکردنێکی (کـەرتی) هـەلاوێردی راستیەکان بوو.



## بەشی دووەم

## لێڵی فەرهەنگی

بۆ دەست نیشان کردنی یەکەیەکی فەرهەنگی، دەبێ نیـشانەی لێکـۆڵراو لە واتایەك زیاتری نەبێت، یان هەڵنەگرێت.

بو نموونە بۆ چارەسەرکردنی وشەی " کورسی" بەرامبەری دەکەین لەگـەڵ ئەوشتانەی کە بۆ هەمان مەبەست بەکار دەهێنرێت، بـێ شـك واتایـەك یـان چەند واتایەکمان دەست دەکەوێت کە بۆ هەمان بـوار ناگەرێتـەوە، هـەردەبێ واتای " کورسی" بدۆزینەوە کە لەبنجو رونانێـك پێکهـاتووە، یـان کۆمەڵـە پارچەیەك کە پاڵپشتی ئامێرێکە وەکو کورسی لووتکەی زەنگ، یان کورسـی ئاش یان کورسی دەستار..هتد.

لەراستیدا ئەو وشانەی کەهەڵگری یەك واتان زۆر دەگمەنن، کـە پێوسـتە واتاناس هەوڵی تێگەیشتنیان بدات، کە ئەمەش کارێکیئەستەمە.

### أ- فرە واتاییو رەگەز دۆزی:

کێشەی دەست نیشانکردنی هەمە جۆری واتای وشە لەچوارچـێوەی زاراوەی رەگەز دۆزیو فرە واتای دەوروژێنرێ، فرە واتایی بـەوە دەناسـرێ کـە ناوێکـە(

دال) چەندین ناو لێنراو( مدلول) کە پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە گرێیان دەدات، بەڵام " دوال" کە چەندین ناولێنراوە، پەیوەندییان بەیەکەوە نیەو بە ( هاوپیتو هاو دەنگ) ناسراون، ئەمەش لە فەرهەنگدا بەرچاو دەکەوێت.

بۆ نموونە وشەی نووسینگە( bureau) بە هاوبێژ دادەنرێت ئەگەر فەرهەنگساز تێبینی ئەوە بکات کە لەنێوان نووسینگە کەبریتییە یە لە مێزێکی کارکردنو نووسینگە وەك شوێنێك کە کارمەندان کاری تێدا دەکەن، ئەگەر هەست بەوە بکەین کەپەیوەندی لەنێوان ئەم دوو ناولێنراوانەدا هەیە دەڵێین: پەیوەندی بە رەگەز دۆزییەوە هەیە.

ئەم بۆچوونەمان بۆ لێڵی فەرهەنگی، بەم شێوەیە لە فەرهەنگدا دەگوازرێتەوە دوو وشەی وەك یەك لە واتادا( مەبەست رەگەزدۆزی) یە دەبنە مایەی بابەتی جیاواز، بە پێچەوانەی نیشانەکانی هاوبێژی،واتە ئەوەی ناولێنراوەکانیان شتێکی هاوبەشی گشتی دەیاننوێنێ، ناونیشانی جیاواز پێك دێنن، بۆ نموونە چەند لێکدانەوەیەك بۆ وشەی (مان گرتن" greve" ) واتە وەستان لەکارکردن، و رۆخی دەریا هەیە.

سیمای زاراوەیی بۆ چارەسەرکردنی بە ئارەزوو، بەنیسبەت فەرهەنگسازەکان ئەمەیان خستە روو کە پێوەری جیاکردنەوە لەنێوان رەگەز دۆزیو فرە واتایی هەموو کاتێك سەرکەوتوونییە.

یاسای گشتی لەپیادەکردن دا ئەوەیە کە دارشتن پێوەری یەکجارەکی دەداتە بابەت، هەروەك لە وشەی " رێگا"ی فەرەنسی هاتووە"rue" و" rue" رووەك، ئەم دوو وشەیە رەگێکی هاوبەشیان نیە چونکە وشەی یەکەم لە لاتینی "ruga" وەرگیراوەو وشەی دووەم لە " rula".



بەڵام وشەی " fugue" پارچە مۆسیقا، و "fugue" بەزین هەردوو وشەکەی سەرچاوەیان وشەیەکی ئیتاڵی یە کە "fuga" یە.

تەنانەت ئەگەر گریمان هیچ پەیوەندیەکی مێژوویی لەنێوان وشەی " greve" بە واتای رۆخی دەریاو، "greve " بە واتای وەستان لەکارکردن یان مانگرتن نەبێت هەر واتای " greve" مانگرتن لەمێشکمان دەمێنێت.

بەهۆی شارەزایی مێژوویی ئەو وشەیە نەك واتایەکەی تر کەبە رۆخی دەریا هاتووە، چونکە هۆی سەرەکیەکەی بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە کرێکارە بێ کارەکانی پاریس لەگۆرەپانی "greve" کەدەکەوێتە رۆخی روباری سین کۆدەبنەوە.

کێشەکە لەوە دایە کە ئەو وشانەی خزمایەتی رۆنانی گرێیان دەدات، وابەرچاو دەکەون کەبەتەواوی لە خۆوەن.

بەڵام لەلایەن پێوەری دەربڕینی روخساری بەکارهێنراو( نووسین) هەندێ جار نەك ناوەڕۆك بۆ نموونە وشەی"conte" واتە دەگەرێتەوەو وشەی "compte" بە واتای دەژمێرێ، هەر دوو وشەکە رەگەز دۆزن.

بەڵام هەندێ جار دەربڕینی دوور هەیە وەك وشەی" dessin" وێنەو" dessein" بە واتای نەخشەدانان" تصمیم" کە لەو بارانەدا ناتوانین پەیوەندی خزمایەتی رۆنانی هەردوو وشەکە بشارینەوە.

بەڵام لەگەڵ باری دوو ناوی وەك یەكو جیاواز لەواتا، لێرەدا بێ گومان ناولێنراوەکە ناهێڵێ جێگۆڕکێ ی ناولێنراوەکان بۆ هەمان چوارچێوە یان دەق بەکاربێت، بۆ نموونە بەزین" fuit"و"fugue" توخمێکە لەو جۆرەی کە یەکەکانی " fuite" و "escapade" ..هتد تێدایە.

لەسەر ئەوەی کە "fugue" (پارچە مۆسیقا) بەشێکی جیاواز پێك
دێنێتو لەگەڵ وشەکانی (sonate) ئاوازی مۆسیقا( canon) ڕێکخستنی
دەنگی..هتد..ڕێزدەکرێت.

کەدەڵێین: پێنووسەکەم بدێ، دەفتەرەکەم بدێ، پێنووسو دەفتەر بێ
گومان یەکەی جیاوازن بەپێچەوانەی گوتنمان: پێنووسەکەم بدێ، ئەو
پێنووسە باش نانووسێت.

لێرەدا دەبنین وشەی" پێنووس" لەهەموو بەکارهێنانەکانیدا بەرامبەر بە
وشەی قەڵەم جاف، قەڵەم حوبر، (پەرەمووچە)..هتد دەوەستێت، کەواتە
لەهەموو بەکارهێنانەکاندا بابەتەکە هەمان یەکەی فەرهەنگی یە بەڵام کاتی
کە دەڵێین" لێکدانەوەی ئەم پارچە مۆسیقایە گرنگە"

باشترین ئاوازی مۆسیقا بۆ پارچەکانی مۆسیقا" هیچ گومانێك نییە کە
"fugue" پارچە مۆسیقا- وەك ئەوەی پێشتر باسمان کرد- ناگونجێ لەگەڵ
یەکەی" fugue" لەو دوو نموونەیەی خوارەوە:

بەزینی ئەو منداڵە دوو بارە دەبێتەوە

"Les fugues de cet enfant sont frequentes"

لەکاتی بەزینی جانتاکەی ون کرد.

**ب- واتاو بەکارهێنان:**

کێشەی لێلی فەرهەنگی هەمیشە لەروانگەی فرە واتاییو ڕەگەزدۆزی
سەیر ناکرێت، بەڵام هەن لەوانەی بایەخ بە جۆراوجۆری واتای وشەیەك دەدەن،
باشترین ڕۆنان کە ئەم ڕێرەوە بنوێنێ ئەوەیە کە:

(وشە لە دەرەوەی چوارچێوە بێ واتایە)



ئەمەش بەرەو ئەوەمان دەبات کەبڵێین: وشە واتاکەی ڕوون نابێتەوە تەنیا
لە بەکارهێنانی نەبێت، لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانین بلێین: واتای وشە بریتی
یە لە کۆی بەکارهێنانەکانی.

بۆ سەڵماندنی ئەم بۆچوونە دەتوانین نموونە بهێنینەوە، وەك وشەی "
مێزtable" ئەم وشەیە لە ڕواڵەت دا سادە بەرچاو دەکەوێت.

ئەو وشەیە واتای چی یە؟

ناتوانین دەست نیشانی واتاکەی بکەین چونکە لە دەرەوەی چوارچێوەیەکی
دیاریکراو دایە، ئەم وشەیەش واتای جۆراو جۆرو هەمەڕەنگ وەردەگرێت
بەپێ ی ئەو چوارچێوانەی کە تیایدا بەکاردێت.

بۆ نموونە:-

چوارچێوەی ١ = مێزی نان خواردن Table de salle amanger.

چوارچێوەی ٢= مێزی خشتەی ماتماتیكTable de mathmatiques .

چوارچێوەی ٣= مێزی ژوری نووستن Table de unit.

چوارچێوەی ٤= مێزی کردەکان( العمليات)Table d' operation.

چوارچێوەی ٥= مێزی جولاوTable tournate .

چوارچێوەی ٦- شەپکەدارێکی لووس Table rase.

چوارچێوەی ٧ = خشتەی ئەلفبا table alphabetique.

چوارچێوەی ٨ = خشتەی بابەتەکان Table matieres.

چوارچێوەی ٩= مێزی مێزگرد-کۆبوونەوە Table ronde.

چوارچێوەی ١٠ = ئامێری بیستن لە تەلەفۆن Table d' ecoute.

چوارچێوەی ١١= مێزی دانوستان Table negociations.

چوارچێوەی ١٢= خشتەی لۆگاریتمTable Logarithmes.

چوارچێوەی ١٣ = نووسینگە Table de travail.

هتد لە چوار چێوەی جیاوازدا.

لەبواری تێۆری پەنا بردن بۆ بەکارهێنان بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە نەفی هەمان لەوانەیی (احتمال) یان هەمان لەوانەکان بۆ هەموو واتاکان بکەین، چونکە ژمارەی چوارچێوەکان کەدەکرێ بیریان لێ بکرێتەوە بۆ یەکەیەکی واتایی سنوردارە، سەرەڕای ئەمەش هەندێ چوارچێوە هەیە کە ئەوەندەی واتا توانای هەست پێ کردنی تێدایە.

لەبواری پیادەکردن دا بەشی هەرە گەورەی فەرهەنگ دەکەوێتە ژێر تیۆری بەکارهێنان، ئەمەش هەمان شتە لەگەڵ گەنجینەی زمانی فەرەنسی قەبە" فەرهەنگی زمانی فەرەنسی هاوچەرخ" Larousse 1966" ، " Larousse 1975"و تا رادەیەك لەگەڵ فەرهەنگی (Robert) لە هەموو ئەم بارانەدا جیاکردنەوەی واتا هەمە جۆرەکانی وشەیەك وەك رەنگدانەیەك بۆ جیاکردنەوەی روخساری زمانی سەیردەکرێت.

روونکردنەوەیەکی تر بۆ تیۆری بەکارهێنان هەیە ئەویش جیاوازی واتایی دوو زاراوەی وەك هاودەنگ( تەواو)، کە چوارچێوە وا پیشان دەدات کەبڵێین: نووکی تیژ، یان نووکی باریك، بەڵام ناتوانین بڵێین پێلاوی تیژ، کەچی دەڵێن پێلاوی باریك.

هەروەها دەڵێین رکابەریەکی تیژو ناڵێین رکابەریەکی باریك ئەم نموونانە سنوری واتای وشە روون دەکەنەوە کە بەپێ چوارچێوەی بەکارهێنان نەبێت، دەست نیشان ناکرێت.

لەگەڵأ ئەوەشدا هەرچەندە چوارچێوە رۆڵێکی لە دەستنیشانکردنی ( یان بارو یا شێوەی نازمانی) جۆرە واتای یەکەیەکی فەرهەنگی هەیە، وا دیارە باشترە مل کەچی ئەوەبین کە ووشە هەڵگری چەندین گریمانە یا واتایە، واتە، لەچوارچێوەی جیاواز دەتوانێ ئەم واتایانە بداتە دەست.



**ج- شێوەکانی لێڵی:**

ئەو وشانەی کە هەڵگری تاقە واتایەکن لەزماندا زۆر دەگمەنن، زۆربەی یەکە فەرهەنگیەکان پتر لەواتایەکیان هەیە.

کێشەی لێڵی فەرهەنگی لە کوێ سەرهەڵدەدات؟ لای زۆربەی زمانەوانەکان لێڵی لەوەوە سەرهەڵدەدات کە وشەیەك پتر لە یەك شیکردنەوە دمانای هەبێت.

بەڵام بەلای ئێمەوە کە باوەڕمان بە لێڵی هەیە، بەزۆری ئەوکاتە لێڵی دروست دەبێت کە قسەکەر لە هەڵبژاردنی کەرەسە بۆ لێدوان توشی گرفت دەبێ. کاتی کێشەی هەڵبژاردن لە لێدوان لەگەڵ گوێگردا دەخرێتە روو.

لەراستیدا، لەکاتی پەیوەندی زمانی دا رەگەز دۆزی بەنسبەت قسەکەر بوونی نییە، ئەوەی کەدەڵێ /so/ بۆ نموونە پێشتر دەزانێ کە مەبەستی (seau) دەوڵك یان (sot) گێل یان ( sceau) مۆرەیە.

بەڵام بەگوێرەی گوێگر یان وەرگر کە کێشەی هەڵبژاردن رووبەرووی دەبێتەوە، ئەگەر خۆی لەبارێك دیت کەئەستەمە دووبارە هەڵبژاردنەکان بۆ قسەکەر بگەرێتەوە، ئەو هەڵبژاردنانەی کە کۆتاییان بەدانانی واتایەك لەواتایەکی تر دەکات، دووبارە دارشتنەوەی لەلایەن گوێگرەوە بۆ هەڵبژاردنەکانی قسەکەر لەرێگای یاسا زمانیەکانی یەوە دەبێت.

بەواتایەکی تر ، تەنانەت، ئەگەر وەك شتێکی ئاسایی بۆمان دەرکەوێت دەبێ بزانین کە لێڵی زمانی پەیوەستە بە لیستی یەکەکان لەبارێکدا کە کردنەوەی هێماکانی هەڵبژاردنی زمانی قورس بێت. کەواتە پێویستە سەرچاوە و واتاسازی تێکەڵ نەکەین، بەڵام ئەم جیاکردنەوەیە وامان لێنەکات کە باوەڕمان بە پێوەندی نێوان سەرچاوە و واتاسازی نەبێت.

لەدوخی جێناو یان ناوی تایبەتی، ئەو ڕووداوەی کە نایزانین ئەوەیە کە
کێ دەڵێ؟ چ دەڵێ؟ بۆکێ دەڵێ؟ لەدەربڕینێکی دەرەوەی چوارچێوەی
(سیاق)و دەرەوەی شوێن و پایە وەك: ئەو پێی گوت، ئەم دەربڕینە هیچ لێڵی
لەئاستی واتادا تێدانیە، تەنیا لێڵی پەیوەندی بەئاستی سەرچاوەوە هەیە
ئەگەر بەپێچەوانەوەش بێت پێویستە ئەوە بڵێین کە هەموو رستەیەك کە
بکەری (جێناوی کۆ) بێت وەك (شتێکیان پێ گوتین) بەتەواوی لێڵە.

لەگەڵ جێناوەکاندا لێڵی بۆ دەست نیشانکردنی کەسەکان دەگەڕێتەوە،
بەڵام لەگەڵ وشەیەکی وەك (خانوو) ئەم وشەیە پەیوەندی بە یەکەیەکی
فەرهەنگی لێڵ هەیە، چونکە نازانین ئەم خانووە چەند ژووری تێدا هەیە،
چەند کەس دەژیت، لەکوێ یە؟..هتد.

## د- شوێنو لێڵی:

ڕای(بلوم فیلد) کە سەرچاوەیەکی زمانەوانی ڕەوشتی بوو، و بۆ ماوەی
چل ساڵ باڵی بەسەر گۆڕەپانی زمانەوانی ئەمریکی داگرتبوو، واتە لە (
بیستەکان تا هەشتاکان). واتای دەربڕینێکی زمانی بەپێ ی شوێنەکەی (
بارودۆخ) دەست نیشان دەکرێت، ئەم دەستنیشانکردنە کێشەی ڕۆڵی، دۆخ
لەبارێکی نازمانی [2] لە لێکدانەوەی واتایی دەربڕین دەوروژێنێ.

بەڵام بە بۆچوونی (کاتسو فودور) "Katz et Fodor" ناکرێ
لێکدانەوەی رستە لە چوارچێوەی ژینگەی زمانی یا کۆمەڵ ئەنجام بدرێت
ئەگەر ئەو واتایەی نەبووبێ، کاتێ دابڕاو بووبێ یان دوور بووبێ لە
چوارچێوەکەی.

---

٢- دەرەوەی زمانەوانی.



دەتوانین بڵێین دەستنیشانکردنی لێکدانەوەکانی رستە بەپێ ی دەوروبەر.
دەبێت لێکدانەوەکان بەپێی ئەو هەڵبژاردنانە بێت کە بەتەنیا وەریانی
گرتووە، ئەمەش شوێنو بارودۆخ دوور دەخاتەوە لە چوارچێوەی زمانەوانی
وەك ئەم رستەیە: (نۆتەکە راستە) ئەگەر ئەم گوتەیە لە هۆڵی مۆسیقا یان لە
چێشتخانەیەك بگوترێت، بەو پێیەی کە پێشتر روونمان کردەوە.

پێویستە تێبینی ئەوە بکەن کە بەکارهێنانی ئاسایی زمان(یش)، لە
سەختی لێکدانەوە بە دوور نیە تەنیا بە هەڵاوێردن نەبێت. لەسەر ئەو
بنەمایەی کە هەموو دەربڕینێك لەجیهانێکی گوتنی تایبەت پێش کەش
دەکرێت، واتە بەپێی بوارێکی دیاریکراو یان چوارچێوەیەکی ناسراو دەست
نیشانکراوە.

بەڵام هەندێ لێڵی راستەقینە کە لەکاتی دەربڕینی گوتن سەرهەڵدەدات
کە یان بۆ تێنەگەیشتنو تێنەگەیشتنی سروشتی نەویستی نێوان دوو قسەکەر
دەگەڕێتەوە، یان بۆ ئارەزوویەك لەسەر لێکۆڵینەوەی لێڵی بەشێوەیەك
کەدەستکاری وشەکان بکرێت یان شوێنی پیتەکانی یەکەمی دوو وشە یان
زیاتر لە بەکارهێنانی زمانیدا بگۆڕێت کە خاوەنی هاو واتان.

وا پێدەچێت ڕەوا نەبێت بڕیار لەسەر چوارچێوەی زمانیو هەڵوێستو
باری دەرەوەی زمانەوانی کە لێڵی دەرەوێننەوە بدەین، ئەوەی کە لێڵی زمانی
دروستی دەکات هەر تەنیا لێڵی یەکی لەوانەیی یە.

لەم ڕوانگەیەوە کەنوێنەری یەکێ لە ئەرکەکانی تیۆری واتاسازی یە،
ناچار دەبین ئەو ڕێگایە بزانین کەدەبێتە هۆی هەڵبژاردنی لەنێوان چەندین
واتای لەبار بۆ یەکەیەکی فەرهەنگی.

بۆچوونەکەی پریتو(Prieto) شایانی ئەوەیە لەسەری بوەستین.

بە گوێرەی (پریتو) خاڵی دەست پێکردنی شیکردنەوەی راستەقینەیی زمانی دەبێ لە چوارچێوەی رووداوی بەرجەستەو هەستپێکراو دابنرێت: واتاو کاری گوتن. واتابە پەیوەندی کۆمەڵایەتی پتەو دەناسرێت کە دەربڕ[3] دەیەوێ دروستی بکات.

کەئەمەش ئامانجی هەموو کردەیەکی گوتنە، واتا دروست کردنی پەیوەندی لەنێوان (أ) دەربڕ و (ب) وەرگر. بۆ نموونە بۆ دروستی کردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی بابەتێك (أ) فەرمان لەسەر (ب) دەکات بۆ ئەوەی قەڵەمەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە، (أ) گۆ دەکاتو دەردەبڕێت بە ( بۆم بگەڕێنەوە). ئەم نموونانە لە نووسراوەکانی پریتو( prieto) بە هێمای دەنگی پێش کەش کراوە.

لە کردەی گوتنی سادەدا دەبینین گوتنێك هەندێ واتا هەڵدەگرێو وە هەندێکی تر لا دەبات، گریمان (ب) دوو قەڵەمی هەیە، قەڵەمێکی رەش کەئێستا پێ ی دەنوسێت، قەڵەمێکی سوور کە لە چەکمەجەی مێزی ئۆفیسەکەیدایە.

دەبینین گوتنی (قەڵەمەکەم بدێ) کە (أـ) دەری دەبڕێ، واتا (داوای قەڵەمی سوور)و( داوای قەڵەمی رەش) لەیەك کاتدا هەڵدەگرێت، ئەم گوتەیەش(داواکردنی دەفتەر) دوور دەخاتەوە، یان (داوای راستە) هتد بەلاوە دەنێ.

کەواتە ئەمەیە رۆڵی گوتە لە دروست کردنی واتادا، کەهەندێ واتا وەردەگرێتو هەندێکی تر وەلا دەنێتو پشت گوێ ی دەخات.

٣- دەربڕ- قسەکرەو گوێگر دەگرێتەوە کە بۆ هەردووکیان بەکاردێت.



بەڵام (پریتو) Prieto بەردەوام دەبێت لەسەر بیرۆکەی خۆی کە گوتە بەتەنیا بەس نیە بۆ دروست کردنی واتا.

ئەگەر دەستەواژەی (قەڵەمەکەم بدێ) رێگا بدات بە وەرگرتنی واتاکانی وەك : داواکردنی قەڵەمی رەشو داواکردنی قەڵەمی سوور، لێرەدا هیچ گوتەیەکی لێڵ نامێنێت، چونکە بێ شك دەبێ بارودۆخی روودانی گوتەکە بێنینە ئاراوە.

شوێنو باری گوتەکەش هەوڵ دەداتو کار دەکات بۆ چەسپاندنی یەکێ لە واتا لەبارەکان.

ئەگەر گوێگر بە قەڵەمی رەشی بنوسیبایەو قەڵەمی سوور لەناو چەکمەجەکەی مێزەکەی بوایە، وا تێدەگەیشت کە قسەکەر داوای قەڵەمە رەشەکە دەکات.

هەروەها لەسەر بۆچوونی (پریتوPrieto) هەموو رووداوێکی گوتەیی، دەربڕینی دەنگی هەندێ واتا وەردەگرێتو هەندێکی تر دوور دەخاتەوە، وەرگریش دەربڕینەکەی تایبەت بە واتایەك لەو واتایانەی کە هاتووە تەرخان دەکات بەپێ ی باروودۆخەکەی. لێرەدا دەبینین ( پریتوPrieto) رۆڵی شوێن کە نرخی نازمانی هەیە روون کردۆتەوە، یان شوێنو بار دەخاتە دەرەوەی زمانەوانی، بەڵام بە توخمێکی گرنگی روودانی گوتن یان پەیوەندی زمانی دادەنێت.





# بەشی سێیەم

## واتای وشە

دوو ڕێرەو لای واتاناسەکان هەیە، ڕێرەوی یەکەم: دەڵێ ڕستە توخمێکی بنجی یە بۆ واتا، بەڵام وشە بەشێکە، پارێکە لەم توخمە گشتی یە، واتە ئێمە لە گشتەوە دەست پێ دەکەین، واتە" لە ڕستەوە دەتوانین بیگەێنیو لە ڕێگای زانیاری واتای ڕاستەقینەی بەشە پێکهێنەکانی ئەو گشتە دەست نیشان بکەین.

یەکێ لە هاندەرەکانی ئەم بۆچوونە هەروەك پێشتر ڕوونمان کردەوە: واتای ڕستە هەمیشە گەورەترە لەنرخی واتای ئەو وشانەی کەپێکی دەهێنن لێرەدا نموونەیەك دەهێنینەوە: منداڵەکە درهەمێك بە پیاوەکە دەدات.

پیاوەکە درهەمێك بە منداڵەکە دەدات.

ڕێرەوی دووەم: لەوەدایە کە لێکۆڵینەوەی واتای یەکەکان بەتەنیا مافی سەرەکی هەیە لە لێکۆڵینەوەی پەیوەندی نێوان واتای وشەکان لە بەکارهێنان دا(واتە لەچوار چێوەدا، چونکە وشە دەبێتە مایەی ڕۆنانی ڕستە).

ئەو واتاناسانەی بایەخ بە ڕستە دەدەن تێبینی ئەوەیان کردووە کە بابەتی واتاسازی فەرهەنگی پێویستە چونکە وشەکان لە فەرهەنگەوە وەردەگیرێن.

بەم شێوەیە دەبینین ئەم کارە بە دوو ئاستی شیکردنەوەی واتایی بەوە بەندە، بەم پێیە پێویستە ئاماژە بە وە بکەین کە زۆربەی واتاناسە ڕۆنانیەکان بایەخیان بە وشە داوە، لە کاتێکدا بەشێکی هەرە گەورەی واتاناسە



بەرهەمهێنەکان گرنگیان پێشتر بە لێکۆڵینەوەی ڕستە داوە.( بۆ گەیشتن بە دەست نیشان کردنی واتا کە واتای وشە چارەسەری دەکات).

بۆیە ئەم بەشەمان بۆ لێکۆڵینەوەی واتای وشە تەرخان کرد، هەر بەم شێوەیش بەشەکەی تر بۆ لێکۆڵینەوەی ڕستە واقت وڕنەمێنیێو سەرت نەسووڕێ.

زۆربەی ئەو نووسەرانەی لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە بە واتاساز لە گرووپی ڕۆنانکارییەکان( بە تایبەتی ئەوروپییەکان) دادەنرێن.

**أ- کێڵگەی واتایی:**

**١- گریمانەی تریر( Trier):**

کۆکردنەوەو داڕشتنی بیرەکان بە شێوەیەکی پتەو بۆ (جوست تریر jost trier)ی ئەڵمانی دەگەڕێتەوە کە گریمانەکەی لەسەردەمی خۆی ( نزیکەی١٩٣٠) سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو کە گەلاڵەی کردووەو لە ڕێبازێك یان پرۆگرامێك داڕشتووە ،دەکرێ بەم شێوەیە کورتی بکەینەوە:

- کۆی گوتنەکانی زمانێکی دیاریکراوە دەبێت لەسەر بنەمای زنجیرەیەك لە کۆمەڵە وشەیەك یان (کێڵگەی فەرهەنگی) بنیات نرابێ هەر کۆمەڵەیەك ڕووبەرێکی دیاریکراو لەئاستی چەمکەکان(کێڵگەی بۆچوونەکان) دەگرێتەوە، سەرەڕای ئەمەش هەر کێڵگەیەك لەم کێڵگانە چ فەرهەنگی بێت چ بۆچوون لە زنجیرەیەك لەیەکەی تەنیشت یەك کە وەکو بەردی فسیفساءوایە پێکهاتوە.

(ترێر) وای بۆ دەچێ بۆچوونەکانمان هەموو راستیەکان دادەپۆشێت بەوەی
کە هەر گۆرانکاریەك لە بۆچوونەکان دەبێتە هۆی گۆرانکاری لە سنوری
بۆچوونی خەڵکانی ترەوە.

ئەگەر هەر کێشەیەك لە کێڵگەیەك لە کێلگە فەرهەنگییەکان هەبێت، یا
هەر گۆرانێك لە ئاستی چەمکەکان رووبدات لەسەر ئاستی ئەو وشانەی کە
دەریان دەبڕین رەنگ دەداتەوە واتە وشەکانو چەمکەکان پەیوەندیان
گۆڕینەوەیە.

ترێر " Trier" لە کتێبەکەیدا: ( یەکەکانی ئەڵمانی لە پێوەری
بۆچوونی درك پێ کردن ( Le vo cabulaire allemand dans le
secteur conceptuel) لەم کتێبەدا لە کیلگەی بۆچوونی زیرەکی لە
زمانی ئەڵمانی لە سەردەمی کۆنو ناوەند لەلای نووسەرە سوفیگەریەکانی
سەدەی سێزدەو چواردەی کۆلیوەتەوە.

"ترێر" وا پیشان دەدات کەیەکەی درك پێ کردن کۆمەڵەیەکی رێكو پێکەوە
توخمەکانیان وەك سیستەمی فسیفساءیەك دەگرنەوەوە ویتەون،
لێکۆڵینەوەکانی" تریێر" سوود بەزانیاری رۆنانی یەکەکان لەماوەیەکی دیاریکراو
دەگەیەنێ، بەلام هەندێ سەختی دەنوێنێ، چونکە بوارەکەی لەو بوارەی کە
پەیوەندی بە بیرکردنەوەوە هەیە پەنگی خواردۆتەوە ئەرکی جیاکەرەوەش
لەدەرەوەی ئەم دا وەك پێویست نیە، بە دەربڕینێکی تر دەڵێین: لە بواری
فیزیاوی‌و بەرجەستەیی هەموو شتێك بەرەوە ئەو باوەڕەمان دەبات کە پێچەوانەی
ئەوەی لەفسیفساءدا دەیبینین چەندین زاراوەی زۆرو تێکچرژاو هەیە.



سەرەڕای ئەوەی کەلێکۆڵینەوەکانی" تریێر" لە بۆچوونو چەمکەکانەوە
سەر هەڵدەدات بەلام هیچ گرنگی یەك بەو گۆرانکاریانە نادات کە لە لایەنی
دەنگی‌و واتایی بەدرێژایی رۆژگار کاریگەرن بەسەرزمان بەکورتی: ئەو
رێگایەی کە بەکارهاتووە زیاتر سوودی خەملاندنی هەیە لەوەی کە زانستی
بێت، چونکە توێژەر پشتی بەهیچ پێوەرێکی دیاریکراو نەبەستووە کەوای
لێبکات وشەکان لە کێلگەی دیاریکراودا پۆل بکات.

**٢- کێشەی دەستنیشانکردن:**

هەرچی بووە و دەبێت، ئەوا گریمانەی سیستەمی ناولێنراوەکان لەکیلگەی
واتایی دا بە هەنگاوێکی گەورە لای واتاناسەکان دادەنرێت.

باشتر وایە لای قۆناغەکانی توێژینەوەی واتایی ئەم نموونەیە
هەڵوەستەیەك بکەین.

لە لێکۆڵینەوەی کیلگەی واتایی دا کێشەیەکی سەخت لە سێ ئاستدا
دەردەکەوێت ئەویش کێشەی دەستنیشانکردنە.

- دەست نیشانکردنی کیلگەی واتایی.
- دەست نیشانکردنی ئەو یەکانەی کەبەشێك لەکیلگەکە پێك دێنن.
- دەست نیشانکردنی گیلگەکان لەنێوان خۆیاندا.

**أ- دەست نیشانکردنی کیلگەی واتایی:**

بۆ ئەوەی باش لە مەبەستی دەستنیشانکردنی کیلگەی واتایی بگەین،
بەخەیاڵ خۆمان لەجێگای واتاناس دادەنێین کاتێ کە بابەتێك وەردەگرین،
توێژەرەکان تێبینی ئەوەیان کردووە کە چۆن واتاناس هەڵسو کەوت دەکات.

واتاناس پشت بەو گریمانەیە دەبەستێت کە بەهۆیەوە ڕۆنانی بناغەی واتایی لەسەر کۆکردنەوەی یەکگرتووی بناغەکان بنیات دەنرێت.

بڕیاری یەکەمی وەرگیراو ئامانجی خۆی دەبێت لەبواری توێژینەوەکە بۆ نموونە، ئایا لێکۆڵینەوەکە پەیوەندی بەبواری فەرهەنگی ڕەنگی رووەکەکان دەبێت ، یان پەیوەندی بە لێکۆڵینەوەی خزمایەتی مەعریفی هۆکارەکانی گواستنەوە ؟ ...هتد

وەلآم دانەوەی ئەم دوو پرسیارە لەوانەیە بۆ ڕێککەوتن یان بەرێکەوت (صدفە) بگەڕێتەوە زیاتر لەوەی کە بۆ کەسایەتی توێژەر.

**ب- دەست نیشانکردنی یەکەکان:**

بواری هەلبژێراو بۆ لێکۆڵینەوە پەیوەندی بە دەست نیشانکردنی یەکەکانی فەرهەنگی یەوە هەیە، ئەو پێوەرەی کە بۆ دەست نیشانکردن بەکاردێت چی یە؟ گریمان بۆ نموونە ئەو بوارەی کەپیادە دەکرێت بواری کێلگەی واتایی وشەی (کورسی) " siege" یە لەزمانی فەرەنسی دا، بەپێ ی هەر پێوەرێك دەتوانین هەر وشەیەك لەم وشانەی خوارەوە ڕیز بکەین یان لایان ببەین:

برادەرێکی دڵسۆز- ناراستەوخۆ- کورسی عاج- شوان- کورسی گەورەو تەنیشت بەرز- بەلەم- کورسی باخچە.-تەختەی ئۆفیس...هتد

دەستەواژەی " برادەرێکی دڵسۆز" پەیوەندی بە یەکەیەکی فەرهەنگی هەیە کەبەهیچ شێوەیەك ناچێتە ناو ئەو کێڵگەیەی کە مەبەستە چونکە پەیوەندی بە کەسانێکەوە هەیە.



ئایا ئەمەئەوە دەگەیەنێ کە ئێمە تەنیا دەست بەو وشانەوە دەگرین کە واتای کورسی دەدەن؟

لەو بارانەدا دەبێ ئێمە کورسی عاج بەلاوە بنێین.

ئایا کیلگەی واتایی کورسی لە زمانی فەرەنسی لە فەرەنسادا یەکسانە لەگەڵ کیلگەی واتایی کورسی لە زمانی فەرەنسی لە کیباك (Quebec)؟

ئەگەر بەختمان بکرێتەوە لەو ڕۆژانە لە فەرەنسا لەو ماوەیەدا بۆ دۆزینەوەی ژمارەیەکی زۆری کورسی گەورەی بە دەسك و بەرز، یا تەختی خەوتنی پشووی نیوەڕۆیان ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هەموو ئەم جۆرانە لە کیباك دا دەست دەکەوێت، بەم جۆرە نەبوونی ئەم جۆرە کورسیانە وا دەکات کە ژمارەیەکی زۆر کەمی خەڵکی کیباك ئەم وشەو زاراوانەی پەیوەستە بەم جۆرە کورسیانە بزانن. دەبێ چ بکەین لە باری داهێنانی شتی نوێ دا، ئەو شتەی کەدەتوانین لەسەری دابنیشین؟

بۆ نموونە کاتێك لە بازاردا جۆرێك لە کورسی دەردەکەوێت کە بەدیوار هەڵدەواسرێت یان لە سەریا دەلەرێتەوە هەندێ یەکەی وەك کورسی لەریو، کورسی هەڵواسراو..هتد. سەرهەڵدەدات، ئەم یەکانەش لە دوکانو شوێنی تایبەت بەکەلو پەلی ناو ماڵ بەکاردێت.

سەرەڕای ئەم دابەش بوونەی زمانی تایبەت بە هەمان یەکەکان: " کورسی هەڵواسراو" ئایا ئەو کورسییە یە کە هەڵیدەواسین یان کورسی هەڵواسراوە؟ ئەم پرسیارە گرنگی خۆی هەیە چونکە ڕێژەی کورسی یەکان لە زمانی فەرەنسی دا تایبەتە بەیەکەکانی ناوەندی لێکدراو یان پێکهاتوو بە یارمەتی وشەی " کورسی" کورسی ئۆفیسی، کورسی باخچە، کورسی

شیرخۆره، کورسی درێژ، کورسی چەماوە کورسی لەرینو، کورسی پێچراو، کورسی بەرز، کورسی کارەبایی..هتد.

ئەمە سەبارە ت بە یەکەی "کورسی" بوو هەمان شت لەسەر دەستەواژەی پێکهاتوو لە " کورسی" کورسی شیرەخۆر، کورسی ماتۆر پیادە دەکرێت، ..هتد. هەروەها تەختی جولاو، تەختی تیپی مۆسیقا..هتد.

بەهەمان شێوەی لەگەڵ وشەی" مقعد" کوشن، کوشنی بێستان، کوشنی پیانۆ، کوشنی مەیخانە..هتد.

پێوستە لێرەدا ئەوە بە بیر خۆمان بهێنیینەوە کە هەڵبژاردنی یەکەیەکی دیاریکراو لەوانەیە بۆ پێکهێنان لە کێلگەیەکی واتایی پێشووی کە باسمان لێوەکرد ببێت.

ئەوەی پەیوەندی بە هاوبێژ یان رەگەز دۆزیەوە هەیە یەکەی پارێزراوە، بۆ هەڵاوێردنی کێلگەی کورسی بۆ نموونە چەندین جۆری واتایی کورسی" siege" دەردەکەوێت.

| | |
|---|---|
| کورسی کۆمەڵایەتی | siege social |
| کورسی فەرمانرەوا | Siege d'un tribunal |
| کورسی پێغەمبەرایەتی | siege apostoliqe |
| فەرمانی شار | siege d une ville |
| باری ئابلۆقە | un elate de siege |



**ج- دەست نیشانکردنی کێلگەکەکان لەناوخۆیاندا:**

گریمان ئێمە چەند کیلگەیەکی واتاییمان رێك خست، لێرەدا ئێمە رووبەرووی کێشەی پەیوەندی چەند کێلگەیەك لەنێو خۆیاندا دەبینەوە، بە واتایەکی تر دەڵێین: رادەو پلەی چوونە ناو یەکی کیلگەکان ( ئەگەر چوونە ناو یەك هەبێت).

لەکاتی لاربوونی یەکەکانیان چەندە؟

لەسەر وتە و دەربڕینی( تریێر) یەکەی فەرهەنگی زمانێکی دیاریکراو وەکو زنجیرەیەکی کێلگە هاوسێکان سەر هەڵدەدات بێ ئەوەی هیچ کونو کەلەبەر یا چوونە ناوێك هەبێت وەك فسیفساء لەگەڵ ئەوەشا کێشەکە هەر دەمێنێتەوە.

**٣- بۆچوون:**

شیکردنەوە لەناو کێلگەی واتاییدا چاکەکەی بۆ (تریێر) دەگەرێتەوە، بەڵام چەند ساڵێکە فەیلەسوف( جیل جاستون فرانجی) (( Gilles Gaston Granger)) لەسەر زۆربەی لێکۆڵینەوەکانی ئێستا کیلگەی واتایی لە کتێبەکەی دا بەناوی " چەند هەوڵ دانێك لە " بواری فەلسەفەی شێواز" سەڵماندوویەتی. "Essai d'une phlilosophie dustgle 1968"

لە روانگەی " فرانجی" بۆ نموونە ناکرێ بە تەنیاو دابڕاوی یەکەی خانوو باس بکەین هەروەك " مۆنان" [٤] بەم شێوەیە باس دەکاتو شیدەکاتەوە،

---

٤- مەبەست جۆرج مۆنان George Monunin خاوەنی کتێبی کیلگەکانی زمانەوانی یە.





بەلاّم دەبێ یەکەی فەرهەنگی لەریز چەند بۆچوونێکی جیاوازەوە سەیر بکرێت وەك: لەرووی بیناسازی یەوە، لەرووی نیشتەجێ بوونـەوە، لـە رووی هونـەری بیناسازی یەوە..هتد.

هەندێ وشە پتر لەیەك کیلگەی واتاییان هەیە، واتە لـە یـەك کاتـدا لـە چەند کیلگەیەکدا هەن وەك وشەی "مانگا" کە دەکرێ بخرێتە ریزی کیلگـەی واتایی ئاژەڵە چوارپێ یەکان واتە لەگەڵ بەراز، شێر، پشیلە...هتـد" پـۆلێن بکرێت.

لە هەمان کاتـدا دەکـرێ لەگـەڵ ئاژەڵـە کاوێژکـەرەکان دابنرێـت. وەك: زەرافەو حوشترو مەڕ..هتد. هەروەها لە کۆمەڵەی ئاژەڵە ماڵیەکانە واتە لـە پۆلی" مەڕ ، ئەسپ، مریشك..هتد"دادەنرێت سەرەڕای چەندین پۆلێنی تر.

بۆ دۆزینەوەی رێکخستنە جیاکانی هەمان کۆمەڵـە یەکـەکان" فرانجـی" رووی لەرێگای دابەشکردنی هاریس "Harris" کرد، بەلاّم بەداخەوە جەختی لەسەر بەکارهێنانی هەست پێکراوی شیکردنەوەی دابەشکردنی هاریس نەکرد هەروەها لەسەر پێوەری دەست نیشانکردن نەرۆیی کە کرۆکی لێکۆڵینەوەیـە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشا رەسەنایەتی خـستنەڕوو بـۆ "فرانجـی" دەمێنێتـەوە کـە شایانە بەرچاو بگیرێت.

### ب- پەیوەندییەکانی واتا:

سەرەڕای بایەخ دان بە پەیوەندی نێوان وشـەکان لـەناو کێڵگـەی واتـایی دیاریکراودا، واتاساز داوای لێ دەکرێت چارەسەری هەندێ نموونەی پەیوەنـدی



نێوان یەکەی دیاریکراو بکات، لێرەدا هەوڵ دەدەین دوو نموونەی تایبـەت بـە پەیوەندی واتایی وەربگرین ئەویش هاو واتاو گرتنەوەیە.

**١- هاو واتا:** بە واتایەکی فراوان، ئەو وشانەی کە جیاوازن لە روخـسار و دەربڕین دا و وەك یەکن لە رووی واتاوە.

ئەمەش ئەو واتایەیە کە دراوەتە هاو واتا لـە فەرهەنگـە تایبەتیەکانـدا. بەهەمان شێوە و چەمك وادەزانین لیستی وشە هاو واتاکان دەبێ تا رادەیـەك درێژ بێت، چونکە کەمتر لە پەنجا زاراوە نادۆزینەوە کە ببێتـە هـاو واتـا بـۆ وشەیەکی وەك:

| | |
|---|---|
| وەری گرت | prendre |
| گرتی | saisir |
| دەستی کەوت | empoigner |
| هەڵی گرتەوە | attraper |
| دەستی بەرسەر داگرت، گیرا | capturer ...هتد |

لە فەرهەنگی تایبـەتی وشـە هـاو واتاکـانی بنـاك "Benac" کارەکـە پەیوەستە بەو وشانەی توانای گۆڕینەوەیان لەنێوان خۆیاندا هەیە.

واتە لەوانەیە وشەیەك شوێنی وشەیەکی تر لە دەربڕینێکدا بگرێت.

لە واتا سازیدا رودەکەینە پێناسەیەکی تەسكو سنوردار بۆ هاو واتـا کـە بریتی یە لە : ئەو وشانەی کە لە هەموو چوارچێوەو بەکارهێنانێك دا دەتوانین بیانگۆڕینەوە یان لەبری یەکتر بەکاریان بهێنین، ئایا هیچ دوو وشەی وا هەیـە کـە توانـای گۆڕینـەوەیان هـەبێتو هـەمان واتـا هـەڵبگرن لـە هـەموو بەکارهێنانەکاندا؟

زۆر کەمن ئەوانەی باوەڕیان بە بوونی ها واتای راستەقینە هەبێت، بۆ نموونە ئەگەر ئەم دوو وشە فەرەنسی یە وەربگرین گوندۆرەی سوور "Pasteque" کالەکی سوور "Melon d' eau" دەبینین وەکو یەك بۆ هەمان واتا بەکارهاتوون، بەڵام دەتوانین بڵێین ها واتای تەواون؟ لەراستیدا ئەگەر دوو وشەی " melond'eau،Pasteque " جێگای یەکتر بگرن لەهەموو بەکارهێنەزمانییەکان دا ئەوا هەریەکە دەبێ تایبەت بە شێوازەیکی زمانی فەرەنسی بێت.

لە ناوچەی کیباك "Le melond'eau" بە زۆری بەکاردێت بەڵام وشەی " Pasteque" زۆربەی خەڵکی کیباك نایزانن ئەمەش لەسەر ژمارە (٧٠) حەفتادا پیادە دەکرێت، دوو وشەی Soixante dix، Septante بۆ هەمان ژمارە بەکاردێتو دەتوانین لە بری یەکتر بەکاریان بهێنین لەهەموو بەکارهێنانەکاندا یان لەچوارچێوەی زمانەکەدا.

بەکارهێنانی " Septante" بۆ دیالێکتێکی فەرەنسی دەگەڕێتەوە ئەو وشەیەش"Septante" لە بەلجیکا بەکار دەهێنرێت ولە فەرەنساو کیباك بەکارنایەت.

ئەگەر بایەخ بە جیاکردونەوەی زمانو دیالیکت نەدەین لە هاو واتاییدا، لەم بارەدا دەبێ وشەی حەفتای ئینگلیزی " seventy" بە هاو واتای "Septante " و " Soixante dix" دابنێین.

ئەگەر لەبواری وشەی فەرەنسی کیابکی " بێنێنەوە، دەبینن هەندێ وشە هەن کە جیاوازیان بەپێی ناوچەو شوێن دەگۆڕێت، بەڵام لەهەمان کاتدا بۆ یەك شت بەکاردەهێنرێن، یان یەك راستی دەردەخەن، بۆ نموونە وشەیەکی ناسراو



هەیە "bouilloire" بویلەر ئەو شتەی کە ئاوی تێدا گەرم دەکرێت، لەناوچەی مۆنتریال بە "Canard" و لە ناوچەی کیباكو سێ ناوچەی تر بە "bombe" نا ودەبرێت، لەهەندێ باری تردا وشە هاو واتاکان کە هاواتاییان دیارە دەبێ بەرچاوبن لەئاستی تۆمارگەی زمانی بەکارهێنراو، بۆ نموونە لە زمانی فەرەنسی میللی"کیباك" هەندێ دەربڕین وەك ئەوەی خوارەوە دەبینین.

سەرەتانێکی کۆنی کڕی cancer ils'est achete un vicux، ،
خەنزیرەیەکی کڕیune minoune .

ئەو دوو رستەیە پەیوەستن بە بەکارهێنانێکی ناسراوە بۆ رستەیەکی وەك: ئۆتۆمبیلێکی کۆنی کڕی.

لەم بارەدا ناچارین تێبینی جیاوازی نێوان تۆمارگەی زمان بکەین کە زۆر سەختە لەوەی کە جیاوازی جوگرافی نێوان دیالێکتە جیاوازەکان لەکاتی گفتو گۆکردندا بچەسپێنین چونکە زۆر دەگمەنە گۆڕانکاری لە دیالێکتدا هەبێت. لە کاتێکدا گۆران لەتۆمارگەدا وەردەگیرێو لەبارە.

وەك پێوەرێك بۆ جیاکردنەوەی نێوان دوو زاراوە یان وشە کەوەك هاو واتا بەرچاو دەکەون، هەندێك پەنایان بۆ جیاکردنەوەی واتای هەست پێکراو واتای درك پێ کراو برد، لەزمانی ئینگلیزیدا بۆنموونە ئاماژە بە باری دوو وشەی "Liberty"و " freedom" ئازدای دەکرێت کە لە ئاستی درك پێکردندا هاو واتان بەڵام لە ئاستی هەست پێکردندا هاو واتانین. هەروەها دەتوانین لەزمانی فەرەنسی دا نموونەیەك وەك ئەمی پێشوو بهێنینەوە کەئەویش وشەی دیموکراتی یە" democratie" کە چەند نرخێکی جیاواز هەڵدەگرێتو بەپێ ی بەکارهێنانی لای دانیشتوانی وڵاتە سەرمایەدارەکان واتای

بەکارهێنانەکەی تیٚ دەگەیشتریٚ، یـان بـەکارهێنانی لـە لایـەن دانیـشتوانی ئۆردوگای ئیشتیراکی واتاکەی لێکدەدرێتەوە.

بەڵام جیاکردنەوەی واتای درك پـیٚ کـراو ( مـەعریفی)و واتـای هەسـتی ( شعوری) دووره لە وەی بلێین لەسەر بنەمای جیاوازی بەشی یان کـەرتی بنیـات نرابێت.

زاراوەی هەستی (شعوری ) وا پێدەچـێت وەکـو جـۆرێکی تێکـەڵاو لـەو توخمانەی پەیوەندیان بە جۆر یان تۆمارگەی زمانی بەکارهاتووە زیاتر لـەوەی پەیوەندی بە باری کۆمەلایەتی یان رۆشنبیری دەربرینەوە هەبێت.

لە باری زاراوەی زانستیو میللی دا دەتوانین هەندێك وشـەی هـاو واتـای تەواو بدۆزینەوە –هەروەك دەردەکەوێت- بۆ نموونە کلۆریدی سـۆدیۆم هێمـای کیمیاوی یـە بـۆ خـۆی بـەڵام کۆمـەڵێك زاراوەی تـر هـەن دەکـریٚ لـەکاتی بەکارهێنان دا جیاوازیان بکرێت بۆ نموونە، کاتی لەسەر مێـزی نـان خـواردن داین نالێین کلۆریدی سۆدیۆمم بدیٚ بەڵکو دەڵێین خوێیەکەم بدیٚ بەپێچەوانەی ئەوەی کە لە تاقیگە روودەدات.

کەواتە دەتوانین بلێین لێرەدا هاوواتای راستەقینەمان نییە.

بەکورتی ئەگەر بۆ چەسپاندنی هاو واتا پشتمان بە پێوەرەکـەمان بەسـت کە توانای وشـە هـاو واتایـەکانو گۆڕینـەوەیان لـە هـەموو چوارچـێوەیەکی زمانیدا ئەوسا بۆ مان دەردەکەوێت کە هاو واتای تەواو نیە یان زۆر دەگمەنە ئەگەر هەبێت.

دەکریٚ هاو شێوەیی یان پەیوەندی دیالێکتەکان بخرێتە سەر ئـەم پێـوەرە، هەروەها دەبیٚ رەچاوی بارودۆخیش بکرێت( چونکە ئەوەندەی کە سروشتی یە



ئەوەندەش دووبارە کۆمەڵایەتیو رۆشنبیری یە بیٚ گومـان لەکۆتاییـدا دەبـیٚ تێبینی ئەوە بکەین کە زۆر قورسە دوو وشەی هاو واتای تەواو بدۆزینەوە.

خودی هاو واتای تەواویش زۆر گرنگ نیە چونکە پەیوەستە بە لایـەنێکی زمانی، چارەسەرکردنی بیٚ سوودە چونکە بە پێـچەوانەی یاسـاکانی ئـابووری زمان دەڕوات.

هەروەها دەتوانین هزری ئەو بارە بکەین کە دوو وشەی هاو واتای تـەواوی تێدا روو دەدات، ئەمەش لەسەر دوو وەشەی تـەخت " divan" و تـەخت " sofa" لە بەرکارهێنانی ئێستادا لە کیباك کە یـەکێك لـە بەکارهێنانـەکان هەرەشەی لەناو چوونی لیٚ دەکرێت.

**٢- گرتنەوە( الاشتمال):**

جون لاینز"John lyons" وای بـۆ دەچـیٚ کـە یـەکێك لـە پەیوەندییـە سـەرەکیەکانی واتـا لـە رۆنـانی یەکەکانـدا هاپیۆنیمییـە.....[٥] "I'hyponymie" ئەم زاراوەیەش بەپێی پێوەری زاراوەی هاو واتاو دژ واتـا دۆزرایەوە، ئەمەش بە واتای گرتنەوە بـەکارهاتووە، بـۆ نموونـە واتـای وشـە وەنەوشەیی رەنگی سوریش دەگرێتەوە هەروەها وشەی مۆر گوڵیشی بە خـۆوە دەگرێت، یان گوڵیش دەگرێتەوە کەواتـە زاراوەی هـاپێوینمی واتـە گرتنـەوە پەیوەستە بە پەیوەندی واتای بەشی دیاریکراو لەناو واتای گشتی دا.

---

٥- مەبەست لە پەیوەندی گرتنەوەی پیادەکراوە لەسەر ناولێنراوەکان یەکەی فەرهەنگییە کە ئەمەش پەیوەستە بە لۆجێکی پۆل کردن hyponymie

ئەگەر كۆمەڵێك یەكەمان هەبێت یەك واتای گشتی بیانگرێتەوە ئەوسا دەتوانین بڵێین ئەم یەكانە" كۆهاپیۆنیم" ن"Cohyponymes"[٦] هەروەك لەرەنگەكاندا: مۆری سورباو رەنگی ژەنگی..هتد، ئەمانە هاوبەشی رەنگی سورن هەروەها وەنەوشەو گوڵەباخو كۆلیلك..هتد ئەمانەش هاوبەشی گوڵن.

ئەوەی كە پەیوەندی بەرەنگی سوور و گوڵەوە هەیە هەر یەكێك لەم وشانە بە واتایەكی سەرتاپایی گرتنەوە" Superodonnes"[٧] دادەنرێت، ئەمەش بەهۆی سەرتاپاییو گرتنەوەی هەر یە كەیانە.

ئەوەی كە پێویستە لەچەمكی ( ئیپۆنیمی) بكۆلرێتەوە لەوەدایە كەرۆڵی ئەم بابەتە لەزمانە سروشتی یەكاندا بێهێزترە لەوەی كە لەگەڵ یاسا پۆل كردنە زانستییەكاندا هەیە هەروەك لەگەڵ زانستی زیندەوەرزانیو رووەك زانی دا بەدی دەكرێت.

لەگوتنی ئاساییدا واتە گوتنی رەمەكی خەڵك چەندین خانەی بەتاڵ هەیە، بۆ نموونە لەزمانی فەرەنسی دا واتایەكی سەرتاپایی نی یە هەموو ئەو وشانە بگرێتەوە كە بە واتای ئامێر دێت وەك ئەوەی بۆ بەسەر هەڵگەرانو سەركەوتن وەك كورسی ویەیژە بەكاردێت.

لاینز (Lyons) وای بۆ دەچێ كە لەنێوان رێكخستنی زنجیرەیەكی یەك بەدوا یەك هاتن یەكەكانی زمان- بەهۆی پەیوەندی (ئیپۆنۆمی) رۆنانی رۆشنبیری دەبێتە توخمێكی گرنگ كە زمان بەهۆیەوە دەچێتە بواری دەمەتەقێو لێكۆڵینەوەی وەك دامەزراندنو رەوشتەكانو زانینی ناسینەوەی

٦- cohyponyme یەك واتای سەرتاپایی هاوبەشی ناوێك.

٧- superodonnes ، واتای گشتی، وشەی هاوبەش.



جیهانی كە بە پێی رۆشنبیری جیاوازی گۆراو لە رۆشنبیرییەك بۆ یەكێكی تر دەگۆرێت هەروەها پۆل كردنیش جیاواز دەبێت لە زمانێكەوە بۆ زمانێكی تر.

**٣- پەیوەندییەكانی تری واتا:**

لە كۆتاییدا ئاماژە بەوە دەكەین كە لاینز"Lyons" گەشەی بەهەندێ نموونەی پەیوەندی واتایی بنجی كردووە كە ناتوانین بەدرێژی لەم بوارەدا باسیان بكەین. لەو پەیوەندییانە پەیوەندی دژ یەكە بۆ نموونە ئەگەر كراسێك رەنگەكەی سووربێت پێویست بە وە ناكات بڵێین سەوز نیە، هەروەها ئاماژەی بەسێ جۆرە دژیەكی كردووە.

- دژیەكی تەواو یان بەهێز وەك: رەبەنو خێزاندار، نێرو مێ.
- دژیەكی پلەدار وەك: گەورەو بچووك.
- دژیەكی گۆڕینەوە وەك: كڕیو فرۆشتی.

**ج- شیكردنەوەی پێكهاتەكان:** [٨]

شیكردنەوەی پێكهاتەیی — لە بابەتەكەی دا — پشت بە لێكۆڵینەوەی ناوەوەی واتایی وشەكان لەدەرەوەی بەكارهێنان یاخود چوارچێوە دەبەستێت. واتە بایەخ بە لێكۆڵینەوەی توخمەكان یان پێكهێنە واتاییەكانی یەكەیەكی زمانی دەدات، هەروها پەیوەستە بە زانینی چۆنیەتی لێكدانی وشەكان لە نێو

٨-* Analyse componentielle هەروەها بە شیكردنەوەی واتاییو شیكردنەوەی چەمكی ناوبراوە.

خۆیاندا ( لەسەرەتای دروست بوونی ناوەوەیاندا ) . هەروەها  دەتوانین ئاماژە بە شیکردنەوەی واتایی بدەین چونکە بابەتی لێکۆڵینەوەی لەم جۆرەن.

زۆربەی ئـەم شـیکردنەوانە لـە زانـستی دەنگـسازی زمـان هـەڵێنجاوەو وەرگیراوە، چونکە پەیوەستە بە پیادە کردنی ڕێگاکانی گۆرینەوەی سەر واتـا کـە دەبێتـە مایـەی سـەرهەڵدانی  فۆنیمـەکان [٩] یـان دانـە بـچووکەکانی دەربرین.

بۆ نموونە (p) جیاوازە لە (b) لە برگەیەکی وەك bo – po هەروەها (b) لە چەند سیمایەکی دەنگی لەبار  پێکهاتووە وەك دەنگـی لێـوی- دەنگـدار، لەریو ، زاری.

ئەم نموونەیەش لەسەر مۆرفیم [١٠] یان مۆنیم [١١] ی دابڕاو پیادەدەکرێ، وەك وشەی ئەسپ کە لە بەیەکەوە هاتنی واتایی تەباو پەیوەندیدار بە بابەتی وەك: ئەسپ+ مێ پێکهاتووە.

---

٩- فۆتیم- دانەیەکی دەنگی بچووکە

١٠-  مۆرفیم- دانەیەکی ڕۆنانی بچووکە

١١- مینوم — دانەیەکی زمانی بچووکە.



**١- سەرچاوە:**

لەو هەولاَنەی کە بە نموویەکی شیکردنەوەی دابەشی دادەنرێت ئەوەیە کـە جەخت لەسەر دەست نیشانکردنی هێڵە واتاییەکانی پەیوەندیدار بە بابەتەکـە دەکات، یان سیمای یەکە زمانیەکان لەگەڵ دەرخستنی تایبەتمەندی هاوبەشی بابەتەکان کە بەیەك ناو ناسراوە،  ئەویش لەرێگای تێبینی کردنی ڕاستەوخۆ.

لەباری شتە فیزیاوی یە هەست پێکراوەکانەوە، بۆ نموونە ئەو پێنج هێڵـە پەیوەندارە ڕاستەوخۆیەی واتایی یەکەی "کورسی" بەم شێوەیە دەبێت.

- پشتی هەیە
- قاچی هەیە
- بۆیەك کەسە
- بۆ دانیشتنە
- کەرەسەی پتەو لە پێکهاتەی دا هەیە.

هەموو ئەو شتانەی بەناوی کورسی ناو نراون ئەم سمایانەیان  تێـدا بـەدی دەکرێت.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕێگایە نموونەیەك وەردەگرین.

(برنـارد بوتیـە" Bernard  Pottier  1963" ئـەم پێـنج یەکانـەی هەڵبژاردووە کە تایبەتن بە جۆری کورسی لە زمانی فەرەنسی دا.

| | |
|---|---|
| کورسیەکی بێ دەسكو بێ پشت | tabouret |
| کورسی بە دوو دەسك | fauteuil |
| کورسی | chaise |
| تەخت یا قەنەفە | canapé |
| بالیفێکی بچووك پشتی پێبدرێت | pouf |

مەبەست لە دانانی لیستێکی پێناسە نییە بۆ ئەم شتانە، بەڵکو بۆ ئەوەی پێناسەیەکی روخساری ( فیزیاوی) بۆ دابمەزرێت، دوای ئەمە لە روانگەی پێودانگی ئەو وەڵامانەی کەدەستمان دەکەوت.

بەیارمەتی پرسیارە لەبارەکان دەتوانین وەڵامی پۆزەتیف بپارێزین ئەو سیفەتانەش کە پارێزراون وەك هێلی لەباری یەکە لێکۆڵراوەکان دادەنرێت.

بۆ نموونە: سیفات و سیمای جیاوازی ئەو شتانەی بەکورسی ناو دەبرێن دەدۆزینەوە.

| | کورسی (١) | کورسی (٢) | کورسی (٣) | کورسی (٤) |
|---|---|---|---|---|
| q1= چەرم | + | + | - | + |
| q2= بۆدانیشتن | + | + | + | + |
| q3= لە قەدیفە | + | - | + | + |
| q4= لەدار | - | + | - | - |
| q5= لەئاسن | + | - | + | + |
| ------ | | | | |
| N q ن = ... | | | | |



n= ئاماژە بە دوواترین یەکە لە لیستەکەدا دەکات.

هەمان خشتە وەردەگرینو بەرێگایەکی تر پڕی دەکەینەوە.

تایبەتیە لەبارەکانی وشەی کورسی دەردەخەین، واتە لایەنەچاکەکانی (q)جارێك( n) دەنوێنێ ، ( n ) هاوبەشە لەنێو هەموو کورسیەکاندا، لەم خشتەی تردا (m) ژمارەی کورسیەکان دەردەخات بێ پێشاندانی سیمای داواکراو.

بۆ نموونە (n-m)q1 دەستنیشانی ژمارەی هەموو کورسیەکان دەکات.

بۆ نموونە (١٠) کەم ژمارەی (m) ی کورسیەکان کە سیفاتی q ناینگرێتەوە.

بۆ نموونە (٣) واتە (١٠-٣) دەبێتە (٧) کورسی لە چەرم دروست کراوە(q):

| | کورسی ١ | کورسی ٢ | کورسی ٣ | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ q= چەرم | + | + | - | (-/+) | - | (N-M)q 1 |
| ٢ q= بۆ دانیشتن | + | + | + | + | + | Nq2 |
| q٣ = لە قەدیفە | + | - | + | (-/+) | + | (N-M)q3 |
| ٤ q= لەدار | - | + | + | (-/+) | - | (N-M)q4 |
| ٥ q= لەئاسن | + | - | - | (-/+) | + | (N-M)q5 |
| q٦ = بەپشت | + | + | + | (+) | + | Nq6 |
| q٧ = بەپێ | + | + | + | (+) | + | Nq7 |

هەموو کورسی یە ناوبراوەکان ڕیز کـراون بـەو ڕێگایـەی کـەهێمای (S) یارمەتی داون، یەك لەدوای یەکی شیکردنەوەکان ئەوەمان بۆ دەدۆزێتەوە کـە سیما پەیوەندارەکانی کورسی بریتی یە لە:

q2، q9، q10،q13

S1 = q2 بۆ دانیشتن

S2 = q6 بە پشت

S3= q7 بەپێ

S4= q10 بۆ یەك کەس

S5= q13 لە کەرەسەی پتەو

هـەمان ڕێگـاش لەسـەر یەکـەی (کورسـی بـە دەسـك) پیـادە دەکرێـت (Fauteuil). ئەم یەکەیە پەیوەندی بە دەرخـستنی یەکـە گوزارەییەکانـەوە هەیە کاتێك لەگەڵ یەکێ لە یەکەکانی پێشوو یەکتر دەگرێتەوە. وەك یەکـەی : دەسکدار کە نرخەژمارەییەکەی بە ڕێککەوتن دەست دەکەوێت.

S6 ئەگەر پەیوەندی بەیەکەیەکی پێشتر بەکار نـەهێنراوە هـەبێت وەك:( دوودەسکدار) ئەوسا نرخێکی نـوێ دەدرێتـە چ لـەباری ئێـستای S6 یـان بەنیسبەت هەموو زاراوە لێکۆڵراوەکان ، بەکۆی گشتی پێی ئەو پێـنج وشـە بەکارهێنراوە ،شەش هێلی تەبا دەدۆزینەوە:

S1= بۆ دانیشتن

S2= بەپشت

S3= بەپێ

S4= بۆ یەك کەس

S5= لەکەرەسەی پتەو

S6= بەدەسك

تێبینی:

لە بارەی: (بوتیە) pottier پشتەکی بچووکی کەپاڵی پێوە دەنرێت، پـێ ی هەیە چونکە لەسەر زەوی دادەنرێت.

پـاش ئـەوەی لێکۆڵینـەوە لەسـەرجەم هێڵـە دابڕاوەکـان دەکـەین ئـەو خشتەیەمان دەست دەکەوێت.

| | S6 | S5 | S4 | S3 | S2 | S1 | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| S1= | - | + | + | + | + | + | کورسی |
| S2= | + | + | + | + | + | + | کورسی بەدەسك |
| S3= | - | + | + | + | - | + | کورسی بـە دەسـكو بێ پشت |
| S4= | + | + | - | + | + | + | تەخت |
| S5= | - | - | + | + | - | + | پـــشتەکی بـــچووك پشتی بدرێت |

هێمای(S) لەسەرەوەی خانەکان بەئاسۆیی بـۆ بابەتـە واتاییـەکانی کـەوا پیشان دەدات(S) تەنیا تۆخمێکە هەروەك کـەدەڵێن" کورسـی" ئـەم یەکەیـە کرۆکێکی هەیە کە تۆخمەکان یان یەکەکان دەینوێنێ وەك :

S1= بۆ دانیشتن

S2= بەپشت

S3= بەپێ

S4= بۆ یەك کەس

S5= لە کەرەسەی پتەوە

بەرێگایەکی تر دەبێتە

S1 (کورسی) ( S1= ، S2، S3، S4،S5 )

بە واتایەکی تر دەتوانین بلّێین سیمای " بەدەسك" هەوڵ دەدات کورسی بەدەسك لە کورسی بێ دەسك جیا بکاتەوە، هەروەك سیمای " بەپشت" رێگایەکە بۆ ئەوەی کورسی بەپشت لەکورسی بێ پشت جیا بکاتەوە، هەروەها سیمای " بۆیەك کەس" کورسی بەدەسك لە تەخت جیا دەکاتەوە.. هەر بەم شێوەیە.

## ٢- پێناسەکان:

پلانێکی تر هەیە کە جۆرج مۆنان" George Mounin "رەزامەندی لەسەر کردووە ئەوەیش جەخت دەکاتە سەر زانینی رادەی توانینی پێناسەی یەکە فەرهەنگیەکانی کە لە زۆربەی فەرهەنگە باوەکاندا بەرچاودەکەوێتو توانای ئەم پێناسینانە لەسەر زانیاری دان لە بارەی رۆنانی یەکەکانی زمان، هەروەك لە یەکە تایبەتیەکانی نیشتەجێ بوون دا دەردەکەوێت، پێناسەی زاراوە تایبەتیەکانی ئەم چەمکە کە لە فەرهەنگەکاندا دەبینرێت وەك فەرهەنگی "Le petit Larousses" کۆمەڵە سیمایەکی تایبەت بەم واتایە لە وشەی "Paillote" دەدۆزینەوە کە بریتیە لە کەپرێك لە پۆشو پەلاش لە ولآتە گەرمەکان. ئەم وشەیەش سێ هێل یان سیمای هەیە وەك: کەپر/+/ دروس کراو لەپۆشو قەسەڵ /+/ لە شوێنە گەرمەکان.

بۆ وشەی(کەپر) دەبینین خانوو/ +/ دروستکراوی بێ ئەندازیاری.



هەروەها وشەی خانوو /+/ بۆ نیشتەجێ بوون/ دەتوانین ئەنجامی ئەم شیکردنەوەیە لەچوارچێوەی رۆنانی چەمکی یان( شیکردنەوەی پێکهاتەیی ) تۆمار بکەین کە دەبێتە:

| هێلی یەکەکان | خانوو | لەدێ | لەکوێ خواردنو خواردنەوە دەخۆین | لە نیوەڕۆ | هتد | بێ نرخ هتد |
|---|---|---|---|---|---|---|
| جێگای حەوانەوە | + | + | + | | | |
| خانووی لادێ | + | + | | + | | |
| کەپری لادێ | + | + | | + | + | |
| روخاو | | | | | | + |
| هتد | | | | | | |

دیسانەوە ئەم شیکردنەوەیە دەکرێ لەچوار چێوەی پۆلینێکی درەختی یان رۆنانێکی یەك لەدوای یەك بخرێتە روو وەك:

خانووبەرە

خانوو<br>هتد<br>هتد

نیشتەجێ<br>بی<br>خانووی<br>لادێ

کەپری شوان<br>پەنا گە<br>کەپری لە<br>حەسیر<br>هتد

کەپری بچووك<br>کەپرێك لە بەفر<br>دروست کرابێ<br>تەویلە<br>کەپری قەسەل

بەڵام ئەم جۆرە شیکردنەوانە کێشەی پەنابردنە بەر فەرهەنگ دەخاتە روو ئەمەش سنورداری شیکردنەوەی پێناسەکان دەگەیەنی، چونکە ئەم جۆرە پێناسانە لەگەڵ ناوەرۆکی لۆجیکی لەهەموو بارێکدا یەکتر ناگرنەوە.

سەرەڕای ئەمەش دەکرێ تێبینی گواستنەوەیەکی تێدا بکرێت چونکە لەوانەیە پێناسەکانی ناو فەرهەنگ لەسەر جۆری شیکردنەوەی پێکهاتەیی بنیات نرابێ.

**٣- دارِشتن:**

بۆ دەست نیشانکردنی سیمای یەکەکانی زمانی پەیوەندار بەواتا چەندین تاقیکردنەوە کراوە، هەوڵەکەی بیار غیرو"Pierre Guiraud" [١٢] ١٩٦٧ بەرەسەنترو داهێنانتر لەهەموو هەوڵەکانی تر تا دادەنرێت. لە هەوڵەکەی دا بەدوای دۆزینەوەی رۆنانی واتایی وشەکان دەگەرێت، لەپێودانکی راستیەکانی کە زمان دەیداتە خۆی بۆ زانینی دارِشتن. ئەمەش لەرێگای جێ بەجێ کردنی سەرچاوە یان لۆجیکی یەوە نییە هەوڵ دان خۆی لەسەر گریمانەی ئەوە دەوەستێت کە زمان بەرهەمی مرۆڤیو مێژوویی یە، بۆیە ناچارین بەدوای لۆجیکی زمانی رووت بگەرێین کە جیاوازە لە لۆجیکی لوجیك، واتە" ( زمانەکان روخسارین) بۆیە دەبێ واتای وشە پەیوەندی لەگەڵ ئەو بابەتە بێت کەلێی درایژراوە.

بۆنموونە ئەگەر چەمکی وشەیەکی وەك ( فێل کردن) وەربگرین بۆ زانین ئەو وشانەی لێی دارێژراون پێویستمان بە فەرهەنگ دەبێت، بەتایبەتی

١٢- خاوەنی کتێبی زانستی واتاسازی La semantique.



فەرهەنگی زاراوەو فەرهەنگە کۆنو نوێکان .هتد. بەدوای ئەو وشانە دەگەرێین کەچەمکی (فێل کردن) بەخۆوە دەگرن هەروەك چۆن " غیرو" ئەم کارەی کردووە، وشەی فێلبازو فێل لێکراو و فێل دەدۆزینەوە.

لەدوای ئەمە" غیرۆ" جەردی هەموو وشەکانی بەجیاکردو لیستێکی بۆ دانان تا ژمارەی وشە دارێژراوەکان گەیشتە (٢٥٠) وشە. کەواتە مەبەستو ئامانج دۆزینەوەی وشە دارێژراوەکانی وشەکەیە.

لە کۆتایی دا جۆرێکی تایبەت بە وشەی " فێل کردن" دروست دەکەین لەسەر بنەمای خزمایەتی نێوان وشە دراێژراوەکانو ئەو بابەتانەی کە هەر وشەیەك لێی دارێژراوە.

ئەمەش روونکردنەوەی ئەو رێبازەیە کە " غیرۆ" پیادەی کردووە پاش ئەوەی لە (٢٥٠) وشەی فەرەنسی کۆڵیوەتەوە، بەتایبەتی ئەو وشانەی کەگوزارشت لە فێل کردنو دارێژراوەکانی دەکەن.

وشەی فێل کردن بەم شێوەیە دانراوە:

أ- بەفەرمانی میری تاوانبارەکە دەستگیرکرا:

١- بە داوەکە وەبوو( فێڵی لێ کرا).

٢- بەفێل خرایە زیندان (زاڵ بوون بەسەریا).

٣- وەرگرتنی رەگەزنامە: وەریگرت- فێڵی لێ کرا.

ب- ریا( نیفاق):

١- فێل( دەست خەرۆ): لەخشتەبردن، فێل.

٢- خۆشاردنەوە (رووگۆرین- تقنع): شاردنەوە، جوانکردنی کارێك بۆی.

٣- قەڵب: فێل باز، (مۆنافق)، وای پێشان دا، فێل بازی.

**ج- غاردان له دەربڕینی را:**

١- رابواردن —(گاڵته) لادان، دەست خەرۆکردن، وێل بوون.

٢- فەرمان شاردنەوە، ئارام بوون، دەرکەوتن.

٣- لەناکاو، لەپڕ، هەڵخەڵەتاو، بەزی ( شەرمەزاربوو).

د- پەیمان بەجێ نەگەیاندن، یاسا، بنکە.

هـ- تانەگرتن، گاڵتەکردن، خۆ هەڵکێشان.

لەسەر بۆچوونو دەربڕینی ( غیرۆ) بایەخی گـەورەی ئـەم یاسـایانە لـەوە دایە کە چەمکەکان بە روونی لەرێگای ئـەم پۆلـە شـیکردنەوانەوە دادەنرێـت بەوەی کە چەمكو مەزەنـدە ئاسـاییەکان لـەرێگای سـیما ئاسـایی یـەکانی واتادادەنرێتو رێگای جیاواز بەکار دێنێت بۆ دروست کردنـی یەکـە زمانیـە نوێکان کە گوزارشت لە دیاردە جیاوازەکـانی چـەمکی وشـە دەدەنـەوە وەك وشەی " فێل کردن"

بەڵام دانەر خۆی دان بە بوونی هەندێ تێبینی دەنێت.

- ئەو دووسەدو پەنجا وشەیەی کە لێکۆڵینـەوەی لەسـەر کـراوە لـەرووی داڕشتنەوە ناچێتە ناو باری زمانێکی تەبابە درێژی مێژوو ئەمـە لـە لایـەك، لەلایەکی تر ئەگەر بەرامبەرکردنی وشەکان لەروانگەی تەباییو رۆنانی یـەوە بکرێت تا ئەو رۆژەی کە تیایدان دەبیـنین ژمارەیـەکی زۆر لـە وشـەکان ئـەو پەیوەندییە نایانبەستێتەوە یان تێایاندا بەدی ناکرێت.

بۆ نموونەی وشەی" greve " " Plage " دەهێنێتەوە کە بەواتای رۆخی رووبارو دەریاو بەواتای لـەکار وەسـتان، دێـت، دەبیـنین پەیوەنـدی نێوانیـان



بەتەواوی لەخۆوەیە، کەواتـە کارەکـە جـارێکی تـر پەیوەنـدی بـە بـوارێکی جیاوگەوە هەیە.

سەرەڕای ئەم تێبینیانە بۆچی " غیرۆ" بایەخی بە لێکۆڵینەوەیەکی تـردا بۆ دۆزینەوەی تۆانایەکی گەورەی دابڕانو گشتاندنی رێگاکەی بە پشت بەستن ئەوجارەیان بە یاسا پێچەوانەکان؟

لـەجیاتی ئـەوەی لەروانگـەی چـەمکی وەك " فێـل کـردن"و جـۆری رێکخستنی واتایی وشەکە روون بکاتەوە، چەمکی ( الصدمه) ی تاقیکردەوە بە پۆل کردنی هەموو ئەو وشانەی پەیوەندی داڕشتن گرێیان دەدات یەکـەمیان هەمان بنجی داڕشتن لەچوارچیوەی پۆلێکی داڕشتن بێ ئەوەی بایەخ بە واتـای راستەقینەی بدات.

لەدوای ئەمەوە، تەنیا بە ئاماژە کـردن بـۆ ئـەم پۆلـە لـە شـیکردنەوەدا کۆتایی پێ هێنان کە ئێمە جـەخت ناکەینـە سـەری بـەڵام ناچـارین سـیمای زمانی رووت روونبکەینەوە( رێکخستنی یەك بەدوای یـەك) ئەمـەش بـەدەر نییە لەسەرهەڵدانی کێشەی نوێ هەر وەك "غیرۆ" خۆی دانی پیاناوە.

تائێرە سێ رێگای جیاوازی شیکردنەوەی رۆنانمان دەرخستو پشکنی کـە بریتین لە:

- تەکنیکی شیکردنەوەی سەرچاوەیی[١٣] " بوتیە" "Pottier"
- لێکۆڵینەوەی پێناسەی فەرهەنگەکان "مۆنان" "Monuin"
- پەنابردن بۆ داڕشتن"غیرۆ" "Guiraud"

---

١٣- سەرچـاوە Lesreferents: ئـەو شـتانە بـۆ سەرچـاوە دەگەرێتـەوە کـە لـە بەشـی یەکەمدا ئاماژەمان بۆ کرد.

بەڵام ئەم دۆزینەوەیە دوورە پەرێز دەمێنێتەوە تا دەبێتە دۆزینەوەیەکی تەواو و سەرتاپا.

له راستیدا ژمارەیەکی زۆر یاسا هەن کە قورسەو ناکرێ هەموویان لەبەر دریژییان بخەینە روو.

دەتوانین بۆ نموونە رێکخستنی ناو لێنراوەکان تاقی بکەینەوە بەپشت بەستن بە رۆنانی ناوەوەو لەوتەکنیکەوە دەست پێ بکەین کە بە شیکردنەوەی سەرچاوەیی و گۆرانی پێناسەکانی فەرهەنگ بەستراوە ، واتە ئەو پێناسانەی کە لە فەرهەنگ دا رێز کراون یان دەتوانین بەرێگای پشکنین بگەینە دەستنیشانکردنی بەکارهێنانی زمانی زاراوەی تایبەت بە بوارێکی دیاریکراو، وەك بواری هۆکارەکانی گواستنەوە، بواری کەلو پەل، کورسی، مەتبەخ..هتد

دەتوانین پەنابەرینە بەر شیکردنەوەی چەندی یان ئاماری هزرکردنی پەیوەندییەکانی گۆرینەوە لەنێوان ژمارەیەك لەناو لێنراوەکانی جۆراو جۆری وشە، و ژمارەی یەکە بچووکەکانی هەمان وشە، یان ژمارەی یەکە بچووکە باس نەکراوەکان..هتد.

لەهەموو ئەم حالاتانەدا دەبینین کارەکە پەیوەندی بەوگریمانەوە هەیە کە لە شیتاڵکردی پێکهێنەکان هەڵێنجراوەو بەهۆییەوە دەتوانین جەختی لەسەر بکەین کە هەرچەند پێکهێن لەو بوارەدا هەبێت، ئەوەندە تەکنیکی دەستنیشانکردنی سیمای واتایی ووشە دەبێت.

بێ گومان ئەو نموونانە لە شیکردنەوەی دا بە سیمای واتایی گرنگو پتەو پەیوەستن بە بابەتەکە ، بەڵام ئەم یاسایانە تەنیا-تا ئێستا- پێکهاتووە لە دانانی پلانەکان لە لایەکو لەلایەکی تر دەبینین نموونەکانی پیادەکراو هەمیشە



لە چوارچێوەی یەکەکانی بواری دیاریکراو لەرووی فەرهەنگەوە هەڵبژێراوە: وەك: یەکەکانی خزمایەتی، جیهانی ئاژەل، پلەو پایەی سەربازی..هتد واتە لەو بوارانە دایە کە زمان بریتی یە لە (محاکات) گوزراشت کردن لە رۆنانی لۆجێکی یان زانستی کەپێشتر بڕیاری لەسەر دراوە کەواتە ئەوگازاندەیەی کە رووبەرووی ئەم رێگایە دەکەینەوە ئەوەیە کە ئەم شیتاڵکردنە بۆ وشەکان بە پشت بەستن بە خزمایەتی یان پەیوەندیو واتایی دەمان بات بۆ ئەویەکانەی کە پەیوەستن بەکەمترین رادە کە بە مۆرفیمە سیماهەڵگرەکان دەردەبرێت بۆ نموونە وێنە یان شێوەکانی ناوەرۆك یان سیمای واتایی ( مۆنیم)ی "jument" ئەسپ، مێ ولاخ" بریتی یە لە "ئەسپ"و" مێ" ئەو فۆنیمانە خۆیان شیتاڵ دەکرێن بۆ وێنە یان شێوەکانی ناوەرۆك..هتد

بەنیسبەت زانستی دەنگسازی تایبەت [١٤] سیما پەیوەستەکانی خێزانە دەنگی یەکان(٢) (b) " ب" دەنگێکی گۆکراوەو دنگێکی لەریوە، دەنگێکی زاری یە لەگەڵ ئەوەشدا کەئەم سیمایانە فۆنیم نین.

بۆ وەڵام دانەوەی ئەم رکەبەرییە، هەندێك تێبینی ئەوەیان کردووە کە شێوە یان وێنەکانی ناوەرۆك لەوجۆرە بارانەدا دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە لۆجێکستەکان ناویان ناوە" لەدوای زمان"(٣) "میتا لانگویج" یان جۆرێك لەزمانی نموونەیی کە قسەی رۆژانەی پێ دەکەین(واتە زمان بابەتەکەیە) هەرچەندە لەدوایی زمان meta language بوونی راستەقینەی نیە، بەڵکو ئەو زاراوانەی پەیوەستن بە "لەدوای زمان" بەشێکی تەواوکەری زمانە بەکارهێنراوەکەن.

١٤- فۆنۆلۆجی- لێکۆڵینەوە لەدەنگ لەناو رۆنان.

سەرەڕای ئەم گازاندانە کێشەیەکی راستەقینە لەبواری ئەم جۆرە شیکردنەوەیە سەر هەڵدەدات، کە بریتییە لە:

چۆن دەتوانین رێبازێکی بابەتی بۆ سیما واتاییەکان دەست نیشان بکەین؟

پێش هەموو شتێك مەرجە بۆ رێبازی شیکردنەوەیی- بۆ ئەوەی راستەو زانستی بێت دەبێت دوور بێت لەخودی خۆی و بابەتی بێت.

تا ئێستا هیچ تەکنیکێکی وا لەبەردەست دانیە بمانگەینێتە بابەتی راستەقینە بۆیە هێشتا زووە، ئەم رێبازە لە پۆلێن کردن ناوبنێن شیکردنەوەی زانستی یان" ئامادەکردنی بۆ زانستی" چونکە تەنیا چەند هەوڵدانێك بۆ گەرانو پشکنین کراوە، لەوانەیە هەوڵدانێك بەسەر هەوڵدانێکی تر زاڵ بێت بەڵام تا ئێستا هیچ رێبازێکی هەوڵدان نەیتوانیوە ببێتە رێبازێکی نموونەیی:

**٤- شیکردنەوەی پێکهاتە و کێڵگەیواتایی:**

تەکنیکی شیکردنەوەی پێکهاتەیی- کە تا ئێستاش هەر کێشەیە — تاقە سیمای لە توێژینەوەدا لە رێکخستنی یەکە فەرهەنگییەکان لە ناو کێڵگەی واتایی ئاشکرادا، بەم پێیە شیکردنەوەی لەر ێگای سیما واتاییەکان لای دانەرەکانە، واتە رێبازی شیکردنەوەی پێکهاتەیی بۆ وەرگرتنی گریمانەی کیلگەی واتایی وەك تێڕوانین بۆ کیلگەی کورسیەکان، کیلگەی نیشتەجێ یی، کێڵگەی فیێل..هتد.

ئەوەی ئەم لێکۆڵینەوانە جیادەکاتەوە لە کارەکانی تایبەت بە کیلگەی واتاییەکان لەوەدایە کەرێبازی شیکردنەوەی پێکهاتەیی بەدوای رۆنانی فەرهەنگ بەهۆی توخمە پێکهێنەرەکانی ووشە دەگەڕێت. کەچی رێبازەکانی



تری شیکردنەوەی لە بنج دا لە پۆلێنەکەی ترێر" Trier" وەرگیراون کەبەدوای کۆکردنەوەی یەکەکانی فەرهەنگی دەگەرێت بێ ئەوەی لێکیان بکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشا هەندێ مەبەسەت هەن بەرێگای شیکردنەوەی پێکهاتەیی دیاری دەکرێت.

شیکردنەوەی پێکهاتەیی لای ئەنترۆپۆلۆجیە ئەمریکیەکان- بەتایبەتی- بەشێوەیەکی تەکنیکی بەکار نەهێنراوە یان بۆ باسکردنی رۆنانی ناولێنراوە زمانیەکان بەکار نەهێنراوە، بەڵام وەکو هۆکارێك بۆگواستنەوەی رۆشنبیری ( هیندۆ ئەمریکی) بەکار هاتووە.

لەم روانگەیەوە یاساکانی شیکردنەوەی پێکهاتەیی هەوڵ دەدات زانیاری تایبەت بە سروشتی رۆشنبیری کۆمەڵایەتی (وەك ئەو هزرانەی کەتوانای درك پێکردنی پەیوەندیەکانی خزمایەتیو تێگەیشتنیان لە شارستانیەتێکی دیاریکراودا)هەیە بەسیمایەکی زمانی رووت بەدەست بێنێت.

**٥- هزرەکانی واتا:**

دەبینین شیکردنەوەی پێکهاتەیی لای زۆربەی لایەنگرانی رێزمانی بەرهەمهێنو گوێزانەوە بۆ مەبەستێکی بەرایی ئامادەکراوە وەك:

سەرقاڵبوونێکی زۆر بەو رێگایانەی کە واتای وشەکان تێیدا رێکخراوە بۆ دارشتنی دەستەواژە. شیکردنەوەی پێکهاتەیی بەتایبەتی وەك تەکنیکێك بۆ گۆرین یان گۆرینەوەی رۆنانی دەروازەکانی فەرهەنگ بەکار دێت، چونکە واتای وشەکان لەناو رستەدا لەو فەرهەنەگە بگۆرە وەرگیراوە.

ئەمەش نموونەی شیکردنەوەی پێکهاتەیی بەکارهێنراوە لە لایەن "کاتس" "Katz" و فۆدور "Fodor"،لە راستیدا تیۆری واتا سازی بەلای ئەوانەوە لێکدانەوەیە بۆ رۆنانی رێزمانی بە بەکارهێنانی فەرهەنگو ژمارەیەك لە یاسای رەنگدانەوەیی هەروەك لەمەو دوا دەیبینین.

لە چوارچێوەی ئەم هزرانە بۆ واتا، پێناسەکانی ئێستا بۆ فەرهەنگەکان تەواوی مەبەست نادات بەدەستەوە، چونکە هەموو ئەوزانیاریانەی کە پێویستمان پێی هەبێت تیایدا نایدۆزینەوە.

بۆ نموونە ووشەی " مراوی" "Canard" لە فەرهەنگێکی کلاسیکی دا ئاماژە بەناوێکی گشتی دەکات کە چەندین واتا بەخۆوە دەگرێت.

- باڵندەیەکی پێ بە پەنجەی وەك دەست "Oiseau Palmipede"
- گۆشتی هەمان باڵندە.
- هەواڵێکی درۆ.
- نیشانەیەکی قەڵپو قەرەباڵغی.
- پارچە شەکرێك ( لەقاوەدا).

"کاتسو فۆدور" رێژەیەکی جیاواز بۆ پێشکەش کردنی بابەتەکانی فەرهەنگ پێشنیاز دەکەن، ئەم رێژەیەش لەسەر شیکردنەوەی هەموو یەکەیەکی فەرهەنگی بنیات نراوە، کە پەیوەستە بە شیکردنەوەی پێکهاتەییان...ئەم وێنەیەی خوارەوەش دەکرێ ببێتە دارشتێنێك بۆ زانینی پەیوەندیەکانی دانانی هەمان وشە، پەیوەندیەکانی نێوان ووشە جیاوازەکان، هەروەها سەرەرای توانایی زانینی ژمارەی واتا لێلەکان لەکاتی پێویستدا. وشەی"مراوی" دەکرێ بەم شێوەیە پیشان بدرێت:



مراوی

بەرجەستە | نابەرجەستەیی

مردوو | زیندو | نیشانە | هەواڵێکی درۆ

شەکر | گۆشت | رۆژنامە | باڵندە

یەکەی فەرهەنگی

پۆلی رێزمانی

پۆلی واتایی

سیمای جیاکەر

بەپێ ی بۆچوونی "کاتس" و" فۆدور" پۆلە واتاییەکان وەکو کەرەسەی زیندوون، بۆ نموونە چەملكو بۆچوونی گشتین، واتە لەهەموو زمانەکاندا هەنو بەدی دەکرێن.

بەڵام سیما واتاییەکان رەنگدانەوەی هەموو بابەتەکانی واتان لەجیاکەرو تاکی دا. هەرچەندە ختنەروی ئەو نموونەیە زۆر تەواو وکامل نییە.

بۆ ئەوەی وەڵامی وا بدەینەوە کە بگونجی لەگەڵ پێداویستییەکانی تیۆری واتایی دەتوانین دووبارە یەکە فەرهەنگیەکەی" مراوی canard" لە وەرگێرانی فەرەنسی لەبابەتەکەی " کاتس"و "فۆدور" دا دەربهێنین:

بەم شێوەیە:








پۆلە واتاییەکانی نێو کەوانەکان لەو نموویەدا وا دەردەکەوێت کە ئەوپۆلانە بۆچوون بن بۆ واتایی یەکە فەرهەنگییەکەی (مراوی).



کەواتە فەرهەنگ وەك سیستەمێکی بۆچوون دەردەکەوێت بۆ دەرکەوتن و دیاریکردنی یەکەدروستکراوەکان، هەر وەك لێکشانەوەی نێوان واتا جیاوازەکاندا. لە ژێر سایەی ئەم تێڕوانینەدا وا دەردەکەوێت کە سیمای واتا بەشێك نییە لەبەشەکانی زمان خۆی بەڵکو پەیوەستە بە توخمەکانی تیوری کە بە مەبەستی باسکردنی پەیوەندیەکانی واتا لەنێوان توخمە فەرهەنگیەکانی زمانێکی دیاریکراو خراوەتە ڕوو.

## بەشی چوارەم

## واتای رستە

هەروەك لە بەشی پێشوودا تێبینیکرا، هەندێك لە زمانەوانەکان لەو باوەڕەدان کە پەیوەست بوون بەو باسانەی کە لە ئاستی یەکە دابڕاوەکان دایە خۆ هەڵخەڵەتاندنو خەیاڵە، چونکە واتای ووشە بەپێی ئەو ئەرکەی کە لەناو رستەدایە دەگۆڕێت. ئەوەش ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە هەندێ لەتوێژەران خەریکی لێکۆڵینەوەی کێشەی پەیوەندییەکانی نێوان واتای جیاوازی یەکە فەرهەنگییەکانی رستەن، ئەم توێژەرانە بایەخ بە وشە نادەن تەنیا لە رێگای بایەخ دانیان نەبێت لە توخمە گەورەکانی رۆنانی رستە.

### أ- یاساکانی کەواندن:

"کاتسو فۆدور" رووبەرووی چەمکی رەوشتی زۆربەی زاناکانی پێش خۆیان بوونەوە.

ئەو چەمکەی کە هەڵیان بژارد ناگاتە ئەوەی کە لاساییێك، یان موحاکاتێکی ئەو رستانەبێت کە پێشتر گوتراون، ئەوان لاسایی بیرە مەڵبەندییە تیۆریەکەی خۆیان یاساکانی کەواندن دەکەن. واتە ئەو یاسایانەی



رێگا بە کۆمەڵەیەکی کۆتایی هاتوو لە رستەدا بەرامبەر بە کۆمەڵەیەکی بێ کۆتایی لە رستە لەزمانێکی گۆکراودا دەدەن.

گوتن بەلایانەوە ئەوە دەگەیەنێ کە رۆنانێکی نوێ لەو توخمانەی کە پەیوەندییێك گرێیان دەدات دابرێژن. ئەو رێگایەی وامان لێدەکات لە رستەی نوێ بگەین کە ئەو رۆنانە دەگرێتەوە یان لەو رۆنانانە پێك دێت کەلە شیکردنەوەی تەبایی پێك هاتوون ئەو بیرەش تەنیا لەواتای رستەوە دێت کەمافی ئەوەی هەیە بکەوێتە پێش واتای وشە.

کەواتە واتا لەو شوێنە دەست پێدەکات کە یاساکان کۆتایی یان پێ دێت( مەبەست لەیاساکان رێزمانە) لەسەر ئەو رۆنانەی کەدەڵێت:" وەسفی زمانەوانی ئێستایی یاساکانی لێ دەربێت یەکسانە بە واتا".

پێویستە ئەوە بزانین- لە ئاستی رووکردنە فەرهەنگ- کە ئەوەی لە فەرهەنگە ئاساییەکان دەستمان دەکەوێت بە زۆری بریتی یە لە: پەیوەندی نێوان یەکەی فەرهەنگیو واتاکەی، بۆ نموونە ئەگەر وشەی " شەریفhonnete " وەربگرین دەبینین ئەو چەمکانەمان دەداتێ:" باش" و"بەرێز" و" راست" و" دەست پاك " و"هێژا"و" ژنی بەشەرەف" و" ئافرەتی پاك داوێن"..هتد

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ووشەی" شەریف" پەیوەستە بە کەسێك بێ ئەوەی رەگەزەکەی دەست نیشان بکرێت کەئەوە دەگەیەنێ " باش"و " بەرێز"و" راست" و" پاك دەست"و" هێژا" ئەگەر پەیوەندی بەکەسێك هەبوو، لە (رەگەزی مێ) واتای وشەکە دەگۆڕێت بۆ "پاك داوێنی".

لە پێناو ئەو تەبایی واتاییە، "کاتسو فۆدور" پەنایان بردە بەر هێمایەکی تایبەت ئەویش بەکارهێنانی ئەم کەوانانە بوو < > بۆ ئەوەی مەرجی





پێویستو تەواوی ڕۆنانی واتایی لەبار بگەیـەنێ، ئەمـەش ئەوەیـە کـە پـێ ی دەوترێ" هەڵبژاردنی سنوردار"

کە بنەمای سەرەکی یە لەشرۆڤەکردنی یاساکانی کەواندن" بۆیـە وشـەی " شەریف" بەم شێوەیە پێشکەش دەکرێت:

شەریف

ئاوەڵناو

توانا

بەرێز

دوور لە هەموو پەیوەندیەکی سێکسی ناشەرعی

**<(کەس)، و( مێ) >**

ئەو وشانەی کە کەوتوونەتە نێو کەوانە تیژەکان ئەوە دەگەیەنێ کـە واتـای تایبەتی ئەو جۆرە ووشانە ناکرێ شرۆڤە بکـرێ تـەنیا لەچوارچـێوەی زمـانی " شەریف" نەبێت.



ئاشکراو روونە کە پەیوەندی بەکەسێك هەیە لە رەگەزی (مێ) بەڵام گرنگی ئەم جۆرە دەست نیشانکردنە لە هەڵبژاردن ئەو بایەخەی نابێت ئەگەر یاساکانی کەواندن بەشداری نەکاتو نەیەتە گۆڕەپانەوە.

یاسـاکانی کەوانـدن هـەوڵ دەدات توخمـە واتاییـەکانی هـاتوو لـە لقـە جیاوازەکانی سەر بەیەك پۆلی یاسایی لێك بدات. واتە لەژێر هەمان پەیوەنـدی باودا، لێرەدا ئەو بابەتەی کە مل کەچـی یاسـاکانی کەوانـدنی واتـایی دەبێـت رستەیەو هاوشانە لەگەڵ وەسفە رێزمانیەکەی دا.

دەست بە ژێـرەوەی درەخـتی رێزمـانی لـە ئاسـتی ئـایرونی ( مفارقـات) دەکەیەنو دوواتر بەدوای تێکەل تێکەلەکان دادکەوین.

بۆ نموونە لە رستەیەکی وەك: کچە کە ئاوێنە بچووکەکەی فرێ دا.

دەبینین شیکردنەوەی رێزمانی کە خاوەنی رۆنانێکی دراشتنی بەم شێوەیە:




بۆ ئەوەی هەموو لقە لەبارەکانمان دەست کەوێت هەمان هێما (S) لەسەر هەمان پۆلە یاسایییەکانی کۆتایی دادەنێین:

بۆ نموونە S1 لەگەڵ هەردوو پۆلدا دووبارە دەبێتەوە.






ئەوەش کێشەی گەیشتنی ڕێزمانی یە لەهەمان کاتدا کە تیۆری واتایی بۆ دادەنرێت بۆ ڕوونکردنەوە لەسەر ئەم ڕستەیەدا.

نموونە: کچەکە ئاوێنە بچووکەکەی فڕێ دا.

La fillete jette la petite galce.

ئێستا ئەوە ڕوون دەکەینەوە کە هەر یەکەیەکی فەرهەنگی ئەم ڕستەیە چۆن پێشکەش دەکەین پێش ئەوەی دەست بە یاساکانی کەواندن بکەین.

| ەکە | La |
| --- | --- |
| نیشانەی ناسراوی | Art-defini |
| (زانــین لــە ڕێگــای چوارچــێوەی گوتن دا) | Defini dansle contexte |
| کچ | Fillette |
| ناوی بەرجەستە | n.concr |
| دەژمێردرێ | Denombrable |
| مێ | n.fem |
| تەنێکی بەرجەستە | Object physique |
| مرۆیی | Humain |
| بچووك | June |
| مێینە | Femelle |
| فڕێ دەدات | Jette |
| کار | Verbe |
| کاری تێپەڕ | v. tr |





ناچار لەبەر پێداویستییەکانی نموونەکە هەندێ لایەنی واتایی نزیك لە ووشەی "سەهۆڵ" "glace" وازی لێهێنراوە. ئەمەش ئەوسا دەبێت کە ووشەی "glace" گوزارشت لە تەنەکە بداتەوە. کەواتە ناوێکی ژمێردراو نیە. بەهەمان هۆکارەکانەوە بیر بۆ واتا گریمانەییەکانی کاری " فرێ دان" ناچێت. با بزانین چۆن کردەی لێکدانی ئاوەڵناوی (دیاریکراوەکە) لەگەڵ ناوی (دیاریکراو) جێ بەجێ دەبێت کە یەك لەدوای یەك S4 دەبێتە " بچووك"و S5دەبێتە " ئاوێنە"

S4

| 1. | Petit | Adj | (Spatial) | {Depeu de voluem} | <Maetrial> |
|---|---|---|---|---|---|
| | بچووك | ئاوەڵناو | شوێن | قەبار بچووك | "تەن" |

| 2. | Petit | Adj | (temporel) | {tres jenne} | <anime> |
|---|---|---|---|---|---|
| | بچووك | ئاوەڵناو | (کاتی)ماوەیی | زۆر بچووك | چالاك |

| 3. | Petit | Adj | (appreciatif) | {de peu d'importance} | <abstrit> |
|---|---|---|---|---|---|
| | بچووك | ئاوەڵناو | خەملێنراو(تقدیری) | بێ بایەخ | بەرجەستە |

| 4. | Petit | Adj | (apprecitif) | {termed' affection ou de mepris} | <anime> |
|---|---|---|---|---|---|
| | بچووك | ئاوەڵناو | (کاتی)ماوەیی | زۆر بچووك | چالاك |

1- glaee n. Fèminin n. concret (dènombrablemateriel ctach dủnepierre prècieuse).
2- glaee n.  Fèm n. concret dènombrable(emateriel) (objet physique) (comestible) (rafraichissement).
3- glaee n. Fèm n. concret dènombrable(emateriel) (objet physique){lame de verre miroir}.
4- glaee n.  Fèm n. concret dènombrable(emateriel) (objet physique) {verre a chassis mobile}.
S5





S5

| 1. | Glace | n. fem | n. concret | denomrable | material |
|---|---|---|---|---|---|
| | ئاوێنه | ناوی مێ | ناوی بەرجەستە | ژمێردراو | تەن |

(Tache d'une pierre precieuse)

(دروست کردنی بەردی بەنرخ)

| 2. | Glace | n. fem | n.concret | denombrable | material |
|---|---|---|---|---|---|
| | ئاوێنه | ناوی مێ | ناوی بەرجەستە | ژمێرراو | تەن |

(objet physique) (comestible)(rafraichissement)

تەنی بەرجەستە دەخورێ ساردەمەنی

| 3 | Glace | n. fem | n.concret | denombrabie | Material |
|---|---|---|---|---|---|
| | ئاوێنه | ناوی مێ | ناوی بەرجەستە | ژمێردراو | تەن |

(objet physique) {lamade verre, moiroir}

تەنی بەرجەستە پارچە شووشە، ئاوێنە

| 4. | Glace | n. fem | n.concret | denombrable | Material |
|---|---|---|---|---|---|
| | ئاوێنه | ناوی مێ | ناوی بەرجەستە | ژمێردراو | تەن |

(objet physique) {vitre a chassis mobile}

تەنی (هەست پێکراو) بەرجەستە پەنجەرەیەك بە پەروازی جولاو

لە رووی تیۆریو لە روانگەی رێکخستنەکانی S5، S4 لەوانەیە شازدە تێکەڵە هەبێت، باشتر وایە هەڵبژاردەکانی S4 لە ژمارە (١) وە دابنێین چونکە بابەتی <تەن> بە خۆوە دەگرێتو تاقە سیمایەکە لە شوێنێکی تر لە S5 دا دەبێتە سیمای واتایی. دەستنیشانکردنی هەڵبژاردە کارێکی گرنگە لەهەمان کاتدا دانی پێانراوە تاقە نیشانەیە کە رێگا دەدات کەوا واتا یان واتاکانی وشەکە لەگەڵ واتایەك یان واتاکانی وشەیەکی تر لێك بدرێن.

لە نموونەکەی پێشوودا هەرچەندە ناتوانین واتاکانی (٢) لە S4 دا کۆبکەینەوە( بچووك لەواتا لەگەڵ "زۆر بچووك" ) لەگەڵ واتای (٢) لە S5 دا (ئاوێنە لە واتا لەگەڵ " تەرکردن" ئەمەش ئەوە دەگەینێ کە واتای



دووەم بۆ " بچووك" پێویست بەوە دەکات لەژێر یەکەیەك دابێت کە سیمای" چاڵاك"ی تێدابێت چونکە ناتوانین بڵێین بە" سەهۆڵی تەر" بچووکە.

**ب- ژمێریاری رێژەی پشتەکان:**

لای (کاتس) و (فۆدور) یەکەکانی فەرهەنگی دەربڕین دەبێ لێکدراو بێت- هەروەك — بە یارمەتی یاساکانی شیکرنەوەی ناسراو بە " شیکرنەوەی پێکهاتەیی" بەرچاومان کەوت.

هەروەها رێگایەکی جیاوازی تر بۆ پیشاندانی کێشەی واتای رستە هەیە.

ئەم رێگایەش پەیوەستە بە شیکردنەوەی جۆرەها پەیوەندی نێوان یەکەکان. ئەم سیستەمەش لە لۆجێك (المنطق) بەتایبەتی لە ژمێریاری رێژەیی پشتەکان وەرگیراوە.

بەگوێرەی لۆجیك ژمێریاری رێژەی پشتەکان تاقە ئامانجی لەوەدایە کە جۆرەها پەیوەندی لۆجیکی بەدیار بخات، بەڵام ئەوەی گرنگە بۆ ئێمە چۆنیەتی یان ئەو رێگایەی کە بنیاتی لەسەر دەکرێ یا واتاکانی رستەی لێ پێك دێت.

بۆ ئەم مەبەستەش هەوڵ دەدەین هێڵە بنەڕەتیەکانی بۆچوونی (بیارویش Bierwish) بخەینە روو. ئەو وێنەو بیرەی کە (پاڵمەر F.R.Palmar) لە کتێبەکەیدا بەناوی (واتاسازی) لە ساڵی ١٩٧٦دا پێش کەشی کردووە. بەڵام (پاڵمەر) ئەم بیرو بۆچوونەی بەرێگایەکی سادەو تا رادەیەك جیاواز پێشکەش کردووە.

(پاڵمەر) وای بۆ دەچێ کە واتای رستە، گریمانەیە، هەر گریمانەیەك لە چەند زاراوەیەك پێکهاتووە، یان پاڵپشتە یان بەڵگەو سەلماندنە.

پشتەکان زاراوەن‌وگوزارشت لە پەیوەندییەکان دەدەنەوە.

لەبەر ئەوەی بە شێوەیەکی گشتی بە کردارەکانەوە پەیوەستن. بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە بەڵگەو سەلماندنەوە زاراوەن بە زۆری بەناوەکانەوە[١٤]. پەیوەستن.

لە رستەیەکی وەك" احمد یحب فاطمة" ئەحمەد فاتیمەی خۆش دەوێ لەو گریمانەدا" خۆش دەوێ" پشتە و پەیوەندی نێوان هەردوو لا دەردەخات. (ئەحمەدو فاتیمە).

بەپێ ی عورفو رێککەوتن دەکرێ ئەم پەیوەندییە بەم شێوەیە بخرێتە روو (یحب احمد فاطمة)

(خۆش دەوێ ئەحمەد فاتیمە) "fatima،Ahmend " {aime}

لە کوردیدا هەر دەبێتە ئەحمەد فاتیمەی خۆش دەوێ.

لەو جۆرە رستانەدا رێکخستن زۆر پێویستە (١) ئەگەر رستەکە بگۆڕین‌و فاتیمە پێش بخەین واتە بڵێین فاتیمە ئەحمەدی خۆش دەوێ (تحب فاطمة ئەحمەد) لەو بارەدا پاڵدراو گۆڕاوە بەهەمان شێوەیەش واتای رستەکە دەگۆڕێت.

ئەگەر" ئەحمەد" و" فاتیمە" بگۆڕینەوە بە " أ" و"ب" رێژەیەکی بەم شێوەیەمان دەست دەکەوێت [ خۆش دەوێ – یحب] " أ"و"ب" ئەمەش جیاوازە لە رێژەی [ خۆش دەوێ – یحب] " ب" " أ" .

١٤- ناوە فەرەنسییەکان گۆڕاون بەناوی عەرەبی.



بێ گومان دەبێ تێبینی ئەوە بکرێت کە تەنانەت ئەگەر رێژەی (ئەحمەد یحب فاطمة) ئەحمەد فاتیمەی خۆش دەوێ. ئەوە دەگەیەنی کە فاتیمەش ئەحمەدی خۆش دەوێ، بەڵام هەندێ جار پەیوەندییەکە بەرامبەری یە بۆ نموونە لە رستەیەکی وەك. (احمد متزوج من فاطمة) ( ئەحمەد فاتیمەی هێناوە) کە پێویستەو دیارە کە فاتیمەش مێردی بە ئەحمەد کردووە. (فاطمة متزوج من احمد). چاکەکەی ئەم رێگایە لە پیشاندان لەودایە کە لەوانەیە لێکدانی ئەو ئەنجامانەی کە شیکردنەوەی پێکهاتەیی دەمانداتێ دوور ناخاتەوە سەرەڕای ئەمەش ناتوانین درك بە بۆچوونی‌و چەمکەکانی واتا بکەین.

### ج- گریمانەیی:

سەرەڕای ژمێریاری رێژەیی پشتەکان رێگایەکی تر هەیە کە لە لۆجیك وەرگیراوەو بایەخ بە سیستەمی واتای رستەدا دەدات. لەنێوان ئەم رێگایانە رێگایەك هەیە کە سەرنجی ژمارەیەکی زۆر لە واتەناسەکانی لە چەرخی نوێ راکێشاوە ئەم رێگایەش بریتی یە لە : لێکۆڵینەوەی گریمانەکانی گوتن، یان دەربڕینی گریمانەیی.

دەبێ گریمانە چی بێ؟

بۆ نموونە ئەگەر بڵێین، ئەحمەد هەر جگەر دەکێشێ ئەوە گریمانەی ئەوەمان دەداتێ کە ئەحمەد پێشتر جگەرەی کێشاوە هەمان شت لە سەر ئەم رستەیەش پیادە دەکرێت.

ئەحمەد کەمێك شەربەتی[١٥]. بەخالد دا.

١٥- لە دەقی فەرەنسیدا (مەی)یە.





لێرەدا گریمانەی ئەوە دەکەین کە ئەحمەد شەربەتی داوەتە خالد بەڵام پرسیاری ئەوە دەکەین کە چۆن گریمانەیەك بۆ دەربڕینێکی دیاریکراو دادەنێین؟ وەڵامەکە لەوەدایە کە پیادەکردنی ڕێژەی نەرێ لەسەر دەربڕینەکە بەسە، ئەگەر وەکو خۆی بمێنێتەوە تەنانەت ئەگەر ڕێژەکەش بەنەرێ بوودەلێین: کارەکە بەراستی پەیوەستە بەگریمانەکە هەروەك چۆن لە رستەی ( ئەحمەد چیتر جگەرە ناکێشێ) یان (هەڵەیە ئەگەر ئەحمەد بەردەوام بێت لە جگەرەکێشان)

ڕێژەی نەرێ نەکردن لە" ئەحمەد پێشتر جگەرەی دەکێشا" بە راستی دەمێنێتەوە چونکە پەیوەستە بە گریمانە. هەمان دیاردە لەگەڵ دەربڕینی وەك: " ئەحمەد کەمێك شەربەتی نەدا بە خالد" چونکە باشتر وایە داکۆکی بکرێت کە" ئەحمەد شەربەتی بەخالد داوە"

ئەم ڕێژەیە جۆرێکە لە گریمانەکانی دەربڕین" ئەحمەد کەمێك شەربەتی بەخالد دا"

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین: گریمانەکانی دەربڕین لەکۆمەڵێك رستە پێك هاتووە. کە ڕێژەی ئەرێ تیایاندا راستە هەرچەند ڕێژەی نەرێش لەدەربڕینەکاندا هەبێت.

لەکاتێکدا هەندێ لە گۆڕانکاریەکانی ڕێزمانی بەکارنەهێنراوە تەنیا بۆ دۆزینەوە گریمانەکانی دەربڕین نەبێ، وەك پرسیار شوێن کەوتوویی‌و فەرمان ....هتد.

ئێستا هەوڵ دەدەین دۆخێکی دەربڕین لە ڕێژەی نەرێ وەربگرین.

بۆ نموونە: خالید رقی لە مەی نابێتەوە.



وەرگر یان مرۆڤ کە گوێ ی لەم دەربڕینە دەبێت دەتوانێ لەوە بگات کە خالد زۆر حەز لەمەی دەکات، ئایا ئەم رستەیە پەیوەندی بە گریمانەوە هەیە؟

کە شێوازی شوێن کەوتوویی بەکار دەهێنین‌و ئەم ڕێژەیەمان دەست دەکەوێت:" خالید رقی لەمەی نابێتەوە بەڵام زۆریش شەیدای نیە"

لەم بارەدا ڕێژەی ئەرێ" خالید زۆر حەز لەمەی دەکات"

بەتەواوی رووی نەداوە.

کەواتە پەیوەندی ئەم کارە بە گریمانەی دەربڕین نیە"

"خالد رقی لەمەی نابێتەوە"

بەڵام راستی هەمیشە سادە نییە، بۆ نموونە ئەگەر دەربڕینێکی باوڵای فەیلەسوفەکان وەرگرین وەك رستە: پاشای فەرەنسا سەری رووتاوەتەوە) ئەم رستەیە وەکو رووداوێك یان گریمانەیەك وەربگرین کە فەرەنسا پاشای نیە لەوکاتەدا.

دەربرینەکە دەبێتە" پاشای فەرەنسا سەری رووتاوەتەوە" بۆ گاڵتەیە چونکە ئەم جۆرە دەربڕینە پێچەوانەی یاسایەکی بنجی یە لە لۆجیك دا کە پێی دەوترێ گریمانەی هەبوون(مناطقة) واتە هەموو پاڵپشتێك پێویستی بە بەڵگەو سەلماندنێك هەیە واتە لە گریمانەی (ا) دا پێویستە (ا) هەبێت.

سەرەڕای ئەمەش ئەوەی وا دەکات شیکردنەکە ئاڵۆزبێت لەوەدایە کە گریمانە کە هەندێ جار پەیوەندی بەو کارەوە هەیە کە بەکارهێنراوە.

بۆ نموونە کە دەربڕینێکی وەك:" دەزانم خالید ئامادەبوو" لەو بارەدا من داکۆکی لەسەر ئامادەبوونی خالید دەکەم.

لەرێژەی نەرێدا" نەم دەزانی کە خالید ئامادەبوو" بەڵام ئامادەبوونی خالید هەیەو بەراستییە، چونکە پەیوەستە بە "گریمانە" بە پێچەوانەی ئەمەش ئەگەر چوارچێوەی دەربڕینەکە بپارێزینو تەنیا کارەکەی بگۆڕین چی روودەدا؟ ئەگەر بڵێم" حەزم دەکرد خالید ئامادەبووایە" من لێرەدا دڵنیانیم کە خالید ئامادەبووە کەواتە لێرەدا گریمانە نییە.

ئەو گریمانانەی لەسەر زمانە سروشتی یەکان (زمانەکانی مرۆڤ) پیادە یان راڤە دەکرێت زۆر ئاسان نیە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ئاستی شیکردنەوەی واتایی سوودێك دەگەیەنێ کە رێگا دەدات —لە چوارچێوەی سنورەکەیدا- و لە روانگەی سووچی جیاوازەوە واتای دەربڕین بپشکێنرێو لێکۆڵینەوەی ئەم واتایە بکرێت.



## بەشی پێنجەم

### " ئەنجام"

**پەیوەندی نێوان رێزمانو واتاسازی:**

تا ئێستاش هەندێ لێکۆڵەرەوەکان بەردەوامن لە بواری لێکۆڵینەوە لە واتای ووشە، بەڵام زۆربەی ئەو زمانەوانانەی کە بایەخ بە کێشەی رێکخستنی واتایی دەدەن، واتای وشە لە چوارچێوەی رستەدا دەکۆڵنەوە.

ئەوەی کەلە سەری رێك کەوتوونو زانراوە- تا ئێستا- ئاڵۆزترین کێشە کە بە پلەی یەکەم دێت لە لێکۆڵینەوە زمانیەکاندا، کێشەی پەیوەندی نێوان رێزمانو واتایە، بۆیە بە پێویستمان زانی ئەنجامو کۆتایی ئەم کتێبەمان وەك کورتە باسێك بێت بۆ قۆناغە گەورەکانی هەندێ لە رێڕەوەکان بەتایبەتی رێڕەوی ئەمریکی، چونکە رێڕەوەکانی ئەمریکی بەردەوام چەندین توێژینەوەی زمانی لەو بوارانەی کە پەیوەستە بە رێزمانو واتاسازی ئەنجام داوەو ئەنجامی دەدەن.

بە ماوەیەکی کەم لەدوای وتارەکەی (کاتس)و (فۆدۆر) لەسالی **١٩٦٣** ئەوگۆرانکارییانەی کە لە لایەن (کاتس)و (پوستال postal) بەدوای داهات، زمانەوانی بەرهەم هێنانو گوێزانەوە گەشەیەکی گرنگی لە ساڵی دواتر بەخۆوە بینی.

له ساڵی ١٩٦٥ چۆمسکی( Chomsky) کتێبێکی له ژێر ناونیشانی هەندێ لایەنی تێوری ڕێزمانی (Aspects of the therory of sytntax) دەرکرد ئەم کتێبە بۆ زمانی فەرەنسی لەساڵی (١٩٧١) لەژێر ناونیشانی (Aspects de la therorie syntaxique) وەرگێردار چۆمسکی لەکتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە چاوخشاندنێك بە چەندین تیوری بکرێتو بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە یاساکانی (لێکدان) لەئاستی لێکدانەوەی واتایی دا هەیە. پێشنیازی ئەوەشی کرد- لە و ماوەیەدا- ئاستی ڕێزمانی لە ئاستی واتایی جیا بکرێتەوە.

لەسەر ئەو بنامایە یاساکان پێویستیان بە سێ پێکهێن هەیە.

١- **پێکهێنی ڕۆنانی:** ئەمەش پێکهێنی بنکەیی بەخۆوە دەگرێت( یاساکانی دووبارە نوسینەوە یاسا لەسەر بنەمای پۆل کردنو یاسا فەرهەنگیەکان) کە پێویستیان بە ڕۆنانی قوڵ هەیە، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تر پێکهێنی گوێزراو خۆی ڕۆنانی قووڵ دەگورێت بۆ ڕۆنانی سەرەوە یان ڕۆنانی بەرچاو.

٢- **پێکهێنی واتایی:** لە کۆمەڵە یاسایەکی نماینده‌ی واتایی پێکهاتووەکە لە ڕۆنانی قووڵ دا بۆ ڕوونکردنەوەی واتا پیادە دەکرێ.

٣- **پێکهێنی دەنگسازی:** یاساکانی نماینده‌ی فۆنۆلۆژی لەسەر ڕۆنانی سەرەوە پیادە دەکات بۆ لێکدانەوەو دەرخستنی فۆنۆلۆژی.



**تیۆری نموونەیی**

بە شێوەیەکی سادە ئەم بۆچوونە بە " تیۆری نموونەیی" ناونراوە کە دەکرێ بەم شێوەیە پیشان بدرێت.




پێکهاتە بنچیەیەکانی تیۆری نموونەیی چۆمسکی ١٩٦٥ بەپێ ئەم هێلکاریە ، پێکهینەکانی فۆنۆلۆژیو واتای بەپێ ی لێکدانەوەیە، واتە تەنیا باسی دەنگەکان یان واتاکان بێ ڕووداوی ڕستە دەکات، واتە ئەوانە خۆیان ڕستە دروست دەکەن.

پێکهاتەی واتایی سەربار لە ڕاستیدا هەوڵ دەدات هەندێ دیاردەی لە هێلکاریو شێوەکاندا باس کرا درك بکات بۆ ئەوەی تەمو مژی واتایی لە نموونەیەکی وەك" نیشانەکە ڕاستە" ڕوون بکاتەوە: لەوانەیە نیشانەی مۆسیقا یان نیشانەی چێشتخانە بێت.

بە تایبەتی لەڕستە نامۆکانی وەك: فرچەی ددانەکە بە نیگای سووك چاوم لێ سوڕ دەکاتەوە.

سەرەڕای  رستە لێڵە ڕێزمانییەکانی وەك: ئەحمەد فاتیمەی پتر لە خالید خۆشی دەوێت، رستەی باسکراو بە دووبارە ڕۆنانی وەك: ئەحمەد فاتیمەی خۆش دەوێتو فاتیمە لەلای ئەحمەد خۆشەویستە.

پێکهاتەی واتایی بەگشتی هەوڵ دەدات بۆ دووبارە کردنەوەی نموونەکە کە توانای  لێکدانی راستەقینەی نێوان دەنگو واتایە کەچی لەروانگەی گوێزانەوەکان تەنیا هەر روخسارێکی رووتە هەر رێز کراوەو ناتوانێ گۆڕانکاری لە واتاکانی ڕۆنانی قووڵ دا بکات کە پێویستە لەم بوارە دا رەچاو بکرێت کە بە تیۆری نموونەیی ناونراوە، ڕۆنانی قووڵ دەستنیشانی نمایندەی واتاییو ڕۆنانی سەرەوە دەستنیشانی نمایندەی دەنگی دەکات.

ئەو بیرەی کە یاساکانی نمایندەی واتایی لەسەر ئاستی ڕۆنانی قووڵ پیادەی دەکات، هێواش هێواش لە برەوکەوت بەتایبەتی دوای ئەو رەخنانەی کە ژمارەیەکی زۆر لە زمانەوانەکان ئاراستەیان کرد.

لە دەربڕینێکی وەك: ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی ژمارەیەکی کەم لە کتێب دەخوێنینەوە، و(ژمارەیەکی کەم لە کتێبەکان لە لایەن ژمارەیەکی زۆر لەخوێنەران خوێندراونەتەوە).

هیچ هۆکارێكو رێگایەك نیە بۆ دۆزینەوەی هۆی ئەوەی کە ئەم دەربڕینانە خاوەنی واتایی جیاواز بن ئەگەر تەنیا پشت بە ڕۆنانی قووڵ ببەستین هەمان کێشەو تەنگو چەڵەمە لەگەڵ ئەم رستەیەدا سەرهەڵدەدات " ئەحمەد ئەوەی فاتیمەی خۆشی دەوێ" هێز لە سەر وشەی "ئەحمەد" دانراوە. و رستەی " ئەحمەدە ئەوەی فاتیمە خۆشی دەوێ" بەبێ هێز دەبینین جیاوازی لێکدانەوەی واتایی ئەم دوو رستەیە لەئاستی قووڵ دا دەرناکەوێت، چونکە هەردوو رستەکە هەمان ڕۆنانی قوڵێان هەیە کە رستە ی:" فاتیمە ئەحمەدی خۆش دەوێت"ە بەرامبەر بەم کێشانەی کە بەهۆی هەڵبژاردنی تەواوی تیۆری نموونەیی کە



تەواوی لێکدانەوەکانی واتایی لەسەر بنەمای ڕۆنانی قووڵی رستە بنیات دەنێ، دوو رێرەوی گەورە سەریان هەڵداو هێواش هێواش رێگایان خۆش کرد: تا" واتای بەرهەم هێنان" لەگەڵ" لاکۆف " Georges Lakaff" دا دەرکەوت.

" لاکۆف" بەپێی شیکردنەوەی نموونەکانی چۆمسکی وای بۆ دەچێت کە هەردوو رستەی: ئەحمەد باسوقەکەی [١٦]. بە چەقۆ دەبڕی و ئەحمەد چەقۆی بۆ بڕینی باسۆقەکە بەکار هێنا" ڕۆنانی قوولێان (ئەو دوو رستەیە) بەرادەیەکی هەست پێکراو جیاوازە.

ئەو دوو رستەیە پەیوەندییەکی هاوبەش گرێیان نادات( دەتوانێ بیسەلمێنێ بەپێی بۆچوونەکەی لا کۆف- کە ئەو دوو رستەیە بەهیچ شێوەیەك پێك ناچن) ئەمەش  بەهۆی زنجیرەیەك لەسەلماندنو ئەزموونی تاقیگەیی کە زەحمەتە بەو پەلەییە دەستنیشانیان بکەین.

لاکۆف هەوڵی دا  جیاوازی ئەو دوو رستەیە لەرووی ڕۆنانی سەرەوەو بەشداریان لەرووی واتاوە دەربخات وایان لێبکات ژمارەیەکی زۆر لە سیما ڕێزمانییەکانی ئاستی قوولی رستە دابەش بکەن.

بە واتایەکی تر دەڵێین: بۆ ئەوەی پەیوەندیەکی لە بارمان لە رووی ڕۆنانی قوولەوە دەست بکەوێت دەبێ لایەنە لێکچووەکانی واتایی ئاستی سەرەوە بزانین، کە بەم پێیە پێویست دەکات دووبارە توێژینەوە لە ڕۆنانی قوول لە ئاستێکدا کە زۆر دابڕاوترە لەو ئاستەی کە چۆمسکی پێشنیازی کردووە، بکەین.

لە چوارچێوەی ئەم تیۆرییەدا رستە نامۆکانی  واتاییو راستی فەرهەنگی پێویستی بە هێنانەوەی لۆجیكو ڕێزمان بە یەکەوە دەکات بەم پێ یە

١٦- لە دەقی فەرەنسی دا(Antoine)یە.





پێکهاتەی بنکەیی پێشنیازکراو زۆرتر لەهەندێ خاڵ دا — تا سیستەمی لۆجیکی لۆجێکراو(مناطقة) پێك دەچن لاکۆف بۆ ئەم کێشەیە کتێبێکی تەواوی تەرخان کرد بەناوی زمانەوانیو لۆجیکی سروشتی " Linguistique et logique naturelle[17]." لەوکیتبەدا لاکۆف لەو گریمانەیەی کە پەیوەندی لە نێوان ڕۆنانی لۆجیکیو ڕۆنانی ڕێزمانی دا هەیە، دەست پێدەکات.

لاکۆف پەنا دەباتە بەر ئەو چەمکانەی کە لە لۆجیك وەرگیراون بەرێگایەك جۆرێك لۆجیکی تایبەتی دەداتێ کە بە"لۆجیکی سروشتی" ناوی دەبات.

لە ڕووانگەی بینینی شیکردنەوە دیاردەی زمانی دەبێ ڕۆنانی ڕێزمانی ڕستەیەك هەمان وێنەی لۆجیکی ئەو ڕستەیەبێت. ئەمەش پێویست بەوە دەکات ئەو یاسایانەی ڕێژەی لۆجیكو ڕێژەی ڕۆنانی سەرەوە بەیەکەوەگرێ دەدات یاساکانی ڕێزمانی بێت.

بە شێوەیەکی گشتی- بەلای لایەنگرانی واتای بەرهەمهێنان- ئاستی ڕۆنانی قووڵ زۆر پێویست نیە، ڕێزمانیش نابێ سەربەخۆییێکی تەواوی هەبێت. ئەمەش بەهۆی بەراورد بە واتا لە ڕۆنانی ژێرەوە.

هەروەها مەودای ئەوە نییە زنجیرەیەك لە پۆلە ڕێزمانیەکان بانگ بکرێنەوە چونکە ئەم ئاستە لەپۆلەکانی " لۆجیکی — واتایی- ڕێزمانی " پێکهاتووە، دەکرێ ئەم مۆدێلە لەو وێنەیەدا بخرێتە ڕوو.

ڕۆنانی ژێرەوە ⟵ گوێزانەوە ⟵ ڕۆنانی سەرەوە (لۆجیکی واتایی و ڕێزمانی)

١٧- لە ساڵی ١٩٧٢ وەرگێران فەرەنسییەکەی کەتە بازاڕ.



ئەو کێشانەی کە تیۆری نموونەیی وروژاندنی بووە هۆی سەر هەڵدانی گریمانە تازەکان ئەو گریمانانەش بوونە مایەی دروست بوونی واتای بەرهەم هێنان" بەڵام ئەم کێشەیە لەو ئاستەدا لە تیۆریەکەی چۆمسکی ناوەستێت.

بەپێی ئەو گازاندانەی کە دژی تیۆری نموونەیی سەریان هەڵدا" چۆمسکی" لەلای خۆی گەیشتە هەڵبژاردنی واتای لێکدانەوەیی زۆر ئاڵۆز. بەئاشکرا دەرکەوت کەتیۆری نموونەیی دەکرێ هەندێ گۆڕانکاری بەسەرداببێت، لەمەودوا دەکرێ پێکهێنی واتایی لە سنووری نمایندەی ڕۆنانی سەرەوە بێتو تایبەت نەبێت بە ڕۆنانی قووڵ.

ئەمە بوو ئەنجامی هەندێ لە تاقیکردنەوەکانی هەندێ دیاردە کە بەهۆی هێز لەسەر هەندێ لە ووشەکاندا دەر خست. بۆ نموونە لە ڕستەیەکی وەك:" ئەحمەد خۆی لێرە ئامادەیە" بەهێز خستنە سەر وشەی "ئەحمەد" چونکە گریمانەی ئەوە دەکرێت کەسێکی تر لەوێ بووبێ بەڵام ئێمە مەبەستمان(ئەحمەد)ە.

بۆ درك کردن بەو جۆرە دیاردانە چۆمسکی لەسەرەتاوە ئاماژەی بەوە کرد کە هیچ جۆرە هۆکارێکی دەربڕین نیە کە ئەم دیاردانە لە ڕۆنانی قووڵ ڕوون بکاتەوە، بەڵام پاش پشکنینو چەندین تاقیکردنەوە گەیشتە ئەوەی کە پێکهێنی واتایی دەکرێ لە ئاستی سەرەوەدا بنوێنرێت، هەروەك چۆن لە ئاستی ژێرەوەدا دەنوێنرێت.

چۆمسکی ئەوە دەسەلمێنێت کە ڕۆنانی سەرەوە لە توانای دانیە چارەسەری هەندێ لە کێشەکانی واتایی لە هەندێ ڕستەدا بکات. بۆ تێگەیشتنی ئەو جۆرە ڕستانە ناچارین پەنابەرینە بەر ڕۆنانی قووڵ.

بۆ نموونە ڕستەیەکی وەك: زۆر لەخەڵکی کەمێك لەکتێبەکان دەخوێننەوەو ڕستەی: کەمێك لەکتێبەکان لەلایەن خەڵکانێکی زۆر خوێندراونەتەوە. لە و





دوو رستەیەدا ناچارین پەنا بەرینە بەر هەردوو رۆنانەکە رۆنانی سەرەوە رۆنـانی قووڵە بۆ ئەوەی هەست بە جیاوازی نێوان ئەو دوو دەربڕینە بکەین.

بۆ ئەوەی بکرێ لەو جـۆرە دیاردانـەی کـە دەردەکـەون بگـەین چۆمـسکی پێشنیازی ئەوە دەکات. کە رۆنانی قووڵ لەمەو دووا بە تەنیا ئەو ئاسـتە نییـە کە خاوەنی جیاوگێکی وا بێت کەلە رێگـای ئـەوەوە واتـا پێـشبینی بکرێـتو لێکبدرێتەوە کەواتە تیۆری نموونەیی گۆڕاو ناوێکی تری لێنرا ئـەویش" تیـۆری نموونەیی فراوانکراو" ە کە ئـەم مۆدێلـەی چۆمـسکی دەکـرێ لـە وێنـەی وادا دەربکەوێت.




لێکدانەوەی واتایی(١٨). بێ گومان پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کە ئـەو وەرگێرانە ئاماژە بۆ لێکدانەوەی واتایی دەکـات ئەگـەر بکرێـت لـە روانگـەی رۆنانی سەرەوە رۆنانی قووڵ ئەنجام بدرێت ئەوا رۆنانی قووڵ بەردەوام دەبێـت لـە بینینی رۆڵی سەرەکی، چونکە هەموو گۆرانـەکان( گوێزانـەوەکان)ی پەیوەنـدی فەرهەنگی پێش گۆرانەکانی رێزمانی تەواو دەبێت.

لەدووای ئەمەدا دەتوانین بڵێین تەنانەت ئەگەر کرا بۆ ئەو تیۆریـە" تیـۆری واتـایی فراوانکـراو" گەشـەی نـوێی بـەخۆوە ببـینێ، ئـەوا لێکۆڵینـەوە لـەو گەشەیەدا، بێگومان لە چوارچێوەی ئەم کتێبە دەردەچێت.

---

١٨- وەرگێرانی ١٩٧١ .



## لیستی سەرچاوەکان

-Bassam Barake- Dixtionnaire de linguistique Francais- Arabe- press، Tripoli- liban.

-F. de saussure – cours de linguistique general، paris payot-1979.

-Georges Mounin –Clefs pour، In semantique، -paris Edition seghers، 1872.

-jean Dubois – Dictionanrie de lingusitique، paris Larousse، 1973.

- د. عبدالسلام المسدي، قاموس الليسانيات عربي- فرنسي، فرنسي- عربی، الدار العربية للكتاب، تونس ١٩٨٤.